ئەمریکی پەیداکر. . بەلێ ئەڤ گرفتاریە زوی راستی‌یا وێ روهن و ئاشکەرا بۆ بۆ هەمی مللەتێن ئیرانی‌و بۆ هەمی جیهانێ.

پشتی هنگی رژێما خومەینی پەیوەندی‌یێن خوە توند کرن دگەل عیراقێ ودەست هاڤێتێ پشت گیری‌و هاریکاریا پارتا (دعوه) کرو هەرەشە دبرنە سەر رێبازو کاروانێ عیراقێ یێ پێشکەفتن خواز.

هەتاکو گەهشتی‌یە رادەکی کو ل روژا 1980/9/4 بەرێ توپێن گران دانە گوندو باژێرین لسەر توخیبێ عیراقی. . کو بۆیە ئەگەرێ بەرپابوینا ڤی شەرێ قورس و گران.

هەلبەت نەهەر ئەڤەنە ئەگەرێن خۆروکماندنا رژێما خومەینی لسەر بەردەوام بوینا شەری دژی عیراقێ . . لێ گەلەك ئەگەرێن دی‌ژی یێن هەین ژ بۆ ڤێ چەندێ. . وەکو وان تەماعکارێن رژێما ئیرانی دئەردو خێرو بێرێن عیراقی‌و نەکو تەماعی‌یا وی دعیراقێ دە بتنێ بەلکو بۆ گەلەك دەولەتێن دی‌ژی یێن عەرەبی . .ژکەنارێ عەرەبی. .

هەروەسا رژێما ئیرانی دڤێت بڤێ بەردەوام بوینا شەری بنەجیهـ کەت بۆ مللەتێن ئیرانێ کو رژێما ئیرانی رژێمەکا راست و رەهوانە ودڤێت بمینتە لسەر حوکمی. .

ئو دیسا ژ ئەگەرێن بەردەوام بوینا شەری ئەو هاریکاری‌و پشت گیری‌و دەست گرتنا دژمنێ زایونی ددەتە رژێما ئیرانی‌و هنارتنا وان بسپۆرێن زایونی بۆ ئیرانی‌و هنارتنا چەك و تفاقی.

نەکو هەر دژمنێ زایونی. . بەلکو هندە رژێمێن دی ژی یێن عەرەبی وەکو رژێما سوری‌و رژێما لیبی. .

هەلبەت ئەڤ رژێمێن هە وەل رژێما ئیرانی دکەن کو بەردەوام بت دشەری‌دا دژی عیراقێ.

هەروەسا نەشیانا رژێما ئیرانی ژ راوەستانێ لبەرسینگێ بەرگری‌یا ئیرانی‌و رێکخراوا مجاهدی خەلقا ئیرانی‌یا بەرگر و ئەو بزاڤ و چالاکیێن پێ رادبن چ لناڤ ئیرانێ‌دە ئانژی لدەرڤەی ئیرانێ. . کو دەنگ ڤەدان لناڤ هەمی جیهانێ. . لڤێ چەندا مە دیارکری دابزانین کا ئایا چەوا بەرێ خۆ دکەنە هێرشا ئیرانی ئانژی بلا بێژین چەوا بەرێ خۆ دکەنە وان کارێت عەسکەری لژێر دروشمێ بەردەوام بوینا شەری. .

هەتا چ رادەیەکی ڤان هێرشێن ئیرانی تشتەك بدەست ڤە هاتیە؟.

چەند کار کریە سەر کاروبارێن نافخۆیێن ئیرانی وئەنجامێن وی ئایا سەلبی‌نە ئانژی ئیجابی‌نە لسەر بارێ نافخۆیێ ئیرانێ‌و هەلوێستێ وێ یێ دەولەتی؟.

بچ رەنگێ هەبیت و هەر چەوا بیت ئەو رێکا ئیرانی گرتی رێکەکا چەفتەو بەردەوام بوینا شەرێ دژی عیراقێ نەژ باشی‌و بەرژەوەندیا ئیرانێ‌یە چ ژلایێ عسکری ڤە ئان ژلایێ بەشەری ڤە ئان ژی ژلایێ ماددی ڤە نەخاسمە بارێ ئابووری گەلەکێ تێك چوّیە ل ئیرانێ نەخاسمە پشتی عیراقێ گزیرتا خەرج گەماردای‌و رێکا هاریکاریێ ژێ بری. . وپشتی زێدەبوینا بەرگری‌یا مللەتێن ئیرانی . . ژبەر ڤێ هەمی چەندێ . . هەر هێرشەکا نوی بێتە کرن لسەر عیراقا شۆرەشێ . . دێ بەهرا وێ هەر دیسا شکەستن و سەرشۆری بیت. بەلکو پتر دێ جهێ حاکمێن قوم و تەهرانێ خلولەکەت و سست کەت. .

ئو لبەرانبەر ڤێ چەندێ ژی بارێ عیراقێ یێ عسکری‌و سیاسی‌و ئابوری دێ پتر مکوم تر لێ‌هێت. . وپتر دێ هاڤلی‌و پەیوەندی‌یا لناڤ بەرا مللەتی‌و قوماندارێ وی‌صدام حسین دێ زێرەتر لێ هێت. . وباوەری‌یا عیراقی‌یا روژ بۆ روژی زێدە تر لێ دهێت کو رژێما خومەینی بەرسڤا ئاشتیێ نادەت ئیللا بهێزەکا عەسکەری . . و ئەوژی عیراق هەرا تێدا سەرکەفتی‌یە. .

ڤێجا هندی رژێما ئیرانی هێرشێن نوی بکەت دژی عیراقێ‌و هندی نەخشەو پیلانان بگێریت دژی عیراقێ. . دێ هەر ئەنجامێن هێرشێن وان شکەستن و ڤەرەڤین بیت . . ودێ پتر زیان و زەرەو وێران کاری‌و کوشتنی‌و ئێخسیرکرن دێ ژ بەهرا وان بیت. .

# چیرۆکێ لەبەرەی جەنگەوە ..

«شفیق محمود جاف»

لەنێوان بەردی سەخت و دارستانێکی پڕ و چڕدا . . . لەنێوان دۆڵ و هەڵەت و بنار و لوتکەی شاخەکاندا . . . لەگەڵ رەشەبا و باران و بەفر و رهێڵەیێکی تیژدا . . . لەگەڵ سەرمـــاییێکی بێ ئامـانـدا ، لە یەکێ لە کەرتـەکـانی بەرەی ناوچەی باکوردا ، گەیشتینە ئەو هەڤاڵە جەنگاوەرانە . . ئەو بەبر و پڵینگە و بێچوە شێرانە کە لوتکە و بنار ودوڵ و دەشتی سنوری نیشتمانی پیرۆزی عیراقمان ئەپارێزن .

لەوێـوەدا رێـزنـان و سەلاوێکی گەرمیان پێشکەش کردە هەڤـاڵـەکـانـیـان لە جەنـگـاوەرانـی ناوچـەی باشـووردا . . لـەرۆژهـەڵاتـی مەسـرە و میـسـان . . ئەوجەنگـاوەرانـە کە پێشێلی هێـرشـەکانی رژێمی بوگەنی ئێرانی بەکـرێ گیـراوی کردوە . . کـە رۆژهەڵاتی سنوری عیراقی خۆشەویستمانی کردوە بە گۆرستانی دەستدرێژگەران

لە سەرەتـادا هەڤـاڵ فەرمـانـدەی ئەو کەرتـە قارەمانە کە دەورێکی بەرز و دیار داوەی نواندوە لە کەرتی باکوردا پاش پێشوازی کردنمان . . وتی :ـ

ئێمـەی جەنگـاوەرانی ئەم کەرتـە . . لەکـەرتی باکوردا ، خۆمان بەپرۆزەێکی هەمیشەیی دادەنێین لەبۆهێرش بردن و خۆبەخت کردنا ، نەك تەنانەت لە ئاستی سنوری عیراقدا ، بەڵکـو لەپێنـاوی پارێـزی کردنی ئاو و خاك و ئاسمـانی تێکـرای نیشـتمـانی گەورە . نیشتمـانی عەرەبی دا . . هەرواش لە پێنـاوی دەستکـەوتـەکـانمان و وەدیهێنراوەکان لەژێر ئاڵای شۆڕشە مەزنەکەماندا

## هێرشێکی سەرکەوتوویی . .

لەئـەشکـەوتێ لەئـەشکـەوتـەنی ئەو ناوچەیەدا کە یەکێ لەکۆمەڵە جەنگاوەرەکانمان کردویانەتە سەنگەری جەنگە . .

لەوێـدا جەنگـاوەرێکی دلێـر لە جەنگـاوەرە دلێرەکانمان ، بـاسێکی زۆر خۆشی بۆ کردین لە قارەمـانێتی نوانـدن کە وێنەیێکی ژیاوە لە ژیانی جەنگاوەرەکانمان کە بە خوێن و

هەست و هەنـاویـانـدا چەسپاوە لە راپەڕانـدنی ئەرکی پێسپێراویان و سەرکەوتنیان بەسەر دوژمندا . .

هەڤاڵە جەنگاوەرەکە ئەڵێ :-

پاش هێـرشێکی سەرکـەوتـووی بەسـەر دوژمنـدا کە بەرامبـەری سەنگـەر و جێگـاو شوێنـەکـەمـانن، و زیانێکی گەورە گەیـانـدن بە گیـان و چەك و تەقـەمـەنی‌یان . . ئێمە لەشـوێـنـی دانـراوادا . . بەپێی نەخشـەیێکی دانـراو بۆ راپـەڕانـدنی ئەرکی پێسپێـرراومـان کە زۆر بەجـوانی و ڕێکخـراوی دانـرابـو بۆ هێـرش و کشـانـەوەو بەبێ‌زیـان . . ژمـارەمـان بریتی‌بوو لە چەند جەنگاوەرێك دابەشکراین . . بوین بە چوار پەل ،جگـە لە سەرکـردەی پەلـەکە. بینیمان پەلـەکـان ئامـادەن . . بەڵام پەلی دووهـەم دیاری نیە پاش چاوەڕوانێکی دور و درێـژ هیـچ جەنگـاورێـك لەو پەلـە دیـاری‌نـەدا . . بەراستی کەوتینـە پەژارەی ئەوجەنگاوەرانەوە هەمـوومـان بێـدەنگی و سەرسـامی گرتینی . . ئـایـا چییان لێهات!؟ . . لەکاتی کشانەوەمان هەمویانمان بینی!!

لە ناکاودا یەکێ لە جەنگاوەرە دلێرەکانمان بەدەنگێکی پڕ برواوە ـ کە هەمووماني هێنایە هۆش، وتی :-

گەورەم من ئەڕۆم . .

بۆکوێ!؟

راپەڕی و هەستایە سەرپێ . .

بۆجێگـە و شوێنـەکـانی دوژمن . . بۆئـەوەی بگـەمـە راستەقینەی هۆی نەگەیشتنی هەڤاڵەکانمان . .

بەڵێ . . بـەخـۆیشم بیـرم لەوە کردۆتـەوە . . بەڵام بەتەنها نارۆی . . ئەبێ کۆمەڵەیەك لە خۆمان پێکبێنین و بەیەکەوە بڕۆین . . جـەنگـاوەرەکـانـمـان هەریـەکێ لەشوێنی خۆیەوە بەرزەو پێ راست بووەوە، ئـەم دەیگـوت من ئەڕۆم . . ئـەو دەیگوت من ئەڕۆم.

لەپاشان گەیشتینە پێکهێنانی کۆمەڵەیەك لە هەڤاڵەکانمان بەسەرکردەی یەکێ لە جەنگاوەرە شوێن دەست و دەورێکی دیـاردراوەی هەیـە و دلێـری و قارەمـانی نوانـدن و نیشـانەی قارەمانیەتی پێبەخشراوە . .

زۆر بە هێـمـنی و وریـیـای و ئاگـاداری بەرەو جێگـەو شوێنـەکـانی دوژمن ڕێگـەمـان گرتـە بەر، دەنگی چپەیەك بەگـوێمـانـدا هات لە ناو بەردو تاشەکاندا لەو ڕێگەیەوە کە سەرکردەی کۆمەڵەکەمانەهەڵبژاردبو . .

فەرمانیدا بە یەکێ‌لەجەنگاوەرەکانمان . . کە بەو هەڵەتەدا بەزگـەخشێ سەرکـەوێ . . بـەڵێ . . سەرکەوت . . نەختێ راوەستـا و بەم لا و بەولای خۆیـدا پشکنی . . لـەپـاشـان دەستی بەرز کردوە و وتی . . بینیمنەوە . . وەرن . . وەرن . . !!

یەکـەوسـەر بەغـاردان گەیشتینـە هەڤاڵەکانمان . . پێشی پرسیـاری ئێمـە . . وەڵامـمـان درایـەوە . . بەڵێ لەسـەرەتای یەکـەم کاتـەوە . . کـاتی کشـانـەوە . . بـەچـەنـد هەنگاوێك جەنگاوەر «عباس» عباس پێوەبو . . کەوت بەڵام هەڤاڵ دلێر لێی‌نـەگەرا لەوێدا بمێنێتەوە لەسەرشانی خۆی داینا . . بەڵام پاش چەنـد هەنگـاوێـك ئەویش پێوە بو ئەوەبو هەردووکیان کەوتن بە هۆی ئەو دوست ڕێژ و تۆپ بارانە . . لەئەنجاما لە ناچـاریـدا لە بنی ئەم بەردانـەدا خۆمـان پاراستوە چونکە بریـارمـان وادابـو . . کـەنابێ بگەڕێینەوە بەبێ هەڤاڵەکانمان ئەوەیە کە ئێوە هاتن و گەیشتن . .

بەراستی کاتێکی زۆر ستەم و گران بو . . . بەڵێ شوێنی پێـوەبـونبـان و کەوتنیـان نێـزیـك نەبو . . بەڵام نەماندەزانی . . ئایا زامدارنین‌یانچونەتە ریزی شەهیدانەوە!!

بەڵام هەرئەبێ بیانگەینێ . .

بەڵێ . . پـەلێکمـان بەرەو هەڤـاڵـەکانمـان ڕۆیشتن ئەم پەلەکەشمان کە ئێمە بوین کەوتینە پارێزی کردنیان، بەڵێ بەرەو شوێنەکانی دوژمن ڕێگەمان گرتە بەر بەبیرو باوەڕێکی بەرز و هەستێکی مرۆڤـایێتی‌یـەوە لەژێـر ئاگـری دوژمنـدا گەیشتینە هەڤاڵەکانمان . . بەڵام هەردووکیان گیانی پاکیان سپـاردبـوە ئاسمـانی شەهیـدان . . هەردووکیانمان هێنایەوە بەسـەر شانمـانـدا . . لەژێـر بارانێکی تاودا . . لـەژێـر دارو دارستانێکی پڕ و چردا . . هەتا گەیشتینەجێگە و شوێنەکانی خۆمان . .



# والفجریەکەیا ؟!

دیسان شاڵاوی ڕەشی خومەینی
تیك شكێنراوە كەوا ئەبینی
والفجر شەشە خوابتانگرێ
لەم جیهانەدا تۆوتان نەمێنێ
لاشە سووتاوو خەڵتانی خوێنن
دڵ برینداری دەشتی پێنجوێنن
سەرشۆڕی ئەهوار خاکی میسانن
شێواوی چیای لای هۆمەرانن
ئەسیری دەستی ڕۆڵەی عیراقن
راکردووی چنگی سوپای چالاکن
ئەوە بەشتان بێ دڵ پڕ لەقین
لەدوای مردن بەتەمای ژینن؟
قەبر هەڵکەنن دوور لە ئینسانن
هاورێی خائن و جانەوەرانن

● علي ابراهيم درويش ●

# چیرۆکی غەزەلێکی عەلی عارف ئاغا «شاری»

# گوڵ و خونچە

● دڵشاد مەریوانی ●

هاوینی ساڵی 1967 بوو خانووانی گەڕەکی شۆڕش (عەقاری) لە سلێمانی، تا دامێنی کارێزی (قوڕیەشکاو) هاتبوون تازە ماڵی باوکم هاتبوونە ئەو گەڕەکە، قوتابی پۆلی پێنجەمی ئەدەبی بووم.

گردەکەی بەرامبەر گەڕەکی شۆڕش، کە ئێستا مزگەوتی (عەلی ناجی)یە ئاوەدان نەبوو. تاك و تەرا هەندێك بناغەی لێدرابوو؛ بەڵام جێیان هێشتبوو لەشوێن یەکێك لەو بناغانە، کەسێك بەناوی عەبدوڵڵا چایخانەیەکی هاوینەی لێکردبووەوە. لەنیوەڕۆ بەدواوە دەهات. چای سازدەکردو پشکۆی دەگەشاندەوە. بۆچرووکی گۆشت و جگەری برژاوی بەردەدایە ئەوناوە.

ئێمەی کۆمەڵێك لە گەنجانی ئەو سەردەمەی بەئەدەبەوە خەریك بوو، دەچووین و لێی دادەنیشتین. دەمانکردە مشت ومڕو شیعر خوێندنەوەو باس و خواسی شاعیرانی دێرینەمان. بەدەمی‌یەوە لەو بەرزی‌یەوە دەمانڕوانی‌یە سلێمانی‌ی نازدار. بەزەردەپەڕی ئاگرینی. هەوری گەواڵ گەواڵی ئاوریشمین و ڕەنگینی لە ئاگری‌یەوە بۆ پرتەقاڵی و زەرد، بۆ قەنەوزی، بۆ پەمەیی تۆخ، بۆ مۆرو وەنەوشەیی تێکەڵ، بۆ نیلی، بۆ تاریکتر . . . تاد

سەرەڕای ئەوە هات و چۆی شەنگ و شۆخانی شیك و خۆرازێنەر بە دوا تەرزی مۆدیلانی ئەوسەردەمە ئەمجا کیژانی ناسکۆڵەی بەناز نازی هات و چۆی سەربانیان. نازی ڕاخستنی جێی خەوی هاوینان، کە لە تەکاندنی بەتانی و چەرچەفی سەرجێگایانیان دا؛ دڵمان لە خەم و پەژارەی ئەو دەورە دەتەکی.

ئێوارەیەك لەو ئێوارانە، برادەرێکم پاش ئێوارە باش و بەخێرهاتن بێ‌چەندو چوون کەوتە خوێندنەوەی غەزەلێکی شەفاف و ناسك:

**گوڵ و خونچەی بەهارانیش لەتۆ نەشمیلەترنابێ**

**نەمام و عەرعەری کۆرپەش لەتۆ خنجیلەتر نابێ**

. . . . . . . تاد

ڕەنگە یەکەم جار بووبێ پەلە لە شیعر خوێنێکی چاك بکەم هەر کە تەواوی‌کرد، یەخەیم گرت و ووتم:

هانام بۆ هێناوی، ئەم شتە ناسکە هی کێ‌یەو . . کەی‌و . . چۆن و . . بۆچی دانراوە؟ چۆن گەیشتە لات و . . کوێرا لەبەرت کرد؟ دوێنێ ئێوارە تۆ ساغ و سەلیم بوویت . ئەم لەرزوتا بەلەزەتەت لە کوێوە تووش بوو؟

چینێکی باش ناخۆشترین پێکەنین پێکەنی‌و خۆشترین رابواردنیش پێی ڕابواردم ئەوسا حاڵی کردم کە هی عەلی عارف ئاغایەو بەدەست نووس گەیشتووەتە لایی‌و بەنووسراویش بۆی هێناوم، چونکە ئەو چاك دەیزانی، من لەشیعر لەبەرکردن دا چەند تەمەڵم!

چەند ڕۆژێك دوای ئەوە، تووشی شاعیری ئازیزم جەمال شارباژێری بووم. حاڵەکەم تێی گەیاند. ئەویش تێی گەیاندم کە ئەو غەزەلەی لەلایەو زۆری هەژاندووەو لەمن سەراسیمەترە پێم ووت: کاکە تۆ شارەزاتری لەمن. شاعیرتری. تەمەن و تاقیکردنەوەشت زیاترە بەڵکە بیکەیتە پێنجین.

هەر بەناسکی‌یەکەی خۆی، تێی گەیاندم کە تاقیکردنەوەی پێنجینی نی‌یەو لێی دەگەرێ بۆ خۆم. ئەوەشی ووت کە شیعرێکی - داناوە یان دای‌دەنێ بەهۆی کارو تام و چێژی ئەو غەزەلەوە. ئەوەبوو وادەکەی خۆی هێنایە دی. لە یەکێك لەدیوانەکانی‌دا، ئەو شیعرەی بڵاوکردەوەو باسی وابەستەیی شیعرەکەی خۆی‌کردبوو بە

غەزەلەکەی لەمەڕ خۆمان، شیعرەکەی شارباژێری بەمە دەست پێ دەکا:

**چ ئاوازێ ئەوەندەی تۆ ئەبێ نەشئەی لە بینایێ ....تاد**

هەر ئەو هاوینــە منیش بە کاری هەژێنــەری ئەو غەزەلــە شیعرێکم نووسی،

**ئەبێ تیسکێکی خواوەندی، لە چاوی توا، بەجێ مابێ**
**لە کاتێکا ،کەوا یەزدان، بە پەنجەی نەخشی کێشابێ**
**.....تاد**

وەلێ ئەوانــە هیچیان تینوێتی‌یان نەشکانــدم و بڕیـاری تەواوم دا؛ غەزەلــە پێنجین بکـەم دیـارە هەر لەبـەر دەست نووســەکــەی وەرم گرت؛ چونکــە دوای ئەوەی شاعیــر دیوانەکەی «گوڵ و خونچە»ی چاپکرد، هەندێك جیاوازیم بینی، هەر لەم ووتــارەدا باسیــان دەکــەم بەڵام با جارێ پێنجینـەکەی بخـەمـە پێش چاوی خوێنەران، چونکە وا بۆ حەڤــدە ساڵ دەچێ دەمــاو دەم، دەستــاو دەست، شیعـر دۆستان ئاڵ و گۆڕی پێ دەکەن و لە زۆربەی کۆڕو ئاهەنگ و ڤێستیڤالان دا دەیخوێننەوەو زۆربەیان نازانن کە هی منە.

**«گوڵ و خونچە»**

**پەریزادەی بەهەشتی خوا، لە تۆ ووردیلەتر نابێ**
**بێچووە کەروێشکی خرپنیش، لە تۆ نەرمیلەتر نابێ**
**پێکەنینی گوڵی شەوبۆش، لەتۆ جوانکیلەتر نابێ**

**«گوڵ و خونچەی بەهارانیش لەتۆ نەشمیلەتر نابێ**
**نەمام و عەرعەری کۆرپەش لەتۆ جوانکیلەتر نابێ»**
**X X X**

**نی‌یە پۆڕێ کەوا لەنجەی، لەلەنجەی تۆبێ شیرینتر**
**نی‌یە جوانێ کەوا خەندەی، لەخەندەی تۆبێ نەخشینتر**
**نی‌یە سێوێ لەباخان دا ،لە کولمی تۆبێ ڕەنگین تر**

**«لە دونیادا لەتۆ جوانتر، لەتۆ مەحبووب و[1] شیرینتر**
**ئەگەر دەعوا چی‌یەك[2] مابێ، درۆ ناکا ،دەسا بابێ»**
**X X X**

**دەسا بابێ، یوسفی‌بێ، زوڵەیخای بۆ بوو بەخشڵ[3]**
**دەسا بابێ، حۆری‌یەك بێ، لەگریێ، نەك لەمشتێ گڵ**
**دەسا بابێ، بلبلێ‌بێ، لەنیسانا بێتە سەر چڵ**

**«دەسا بابێ ،بابێن بەسەف یەکسەر، هەموو چاوەمەست و ڕوومەت گوڵ**
**بزانە چۆن ئەبێ مەحجووب، ئەوەی وا لافی لێدابێ!»**
**X X X**

**نەکەی باوەڕ هەبێ جوانێ لەبەردەمتا کە خۆی بادا**
**بڵێ نەخشینم و چاکی ڕەزامەندی بەلادا کا[4]**
**گیانە تۆ ڕۆژی دەرکەوتی، ئەستێرەش بێ؛ دەبێ ڕاکا**

**«درۆیە تۆ لە ئینسان بی، ئەمن ئەقڵم قبووڵ ناکا**
**پەریش حەددی نی‌یە وابێ ،ئەبەد حۆریش بە تۆ نابێ»**
**X X X**

**لەتەقواوە[5] بەزاهیدێك[6] چۆن ئەفەرموون گەلێك تەقی[7]**
**منیش وەها زاهیدی تۆم مەیلی دڵم بەرزەو نەقی[8]**
**شەوێك لە زیکرت غافڵ بووم[9] ئازارو ژانم لێ تەقی**

**«کەوابوو! تۆلە نوتفەی[10] نووری پاکی قودرەتی حەقی[11]!**
**ئەبێ مەئوایی ئەسلێشت[12]، عەتارید یا سورەییا بێ[13]!»**
**X X X**

**بەبانگیش پێنج فەرزەکەی دین[14] یەکێکی لێ ئەدا ناکەم[15]**
**کەچی هی‌تۆ بەبێ بانگەو، هەزاریشەو دووای ناخەم**
**ڕازی بوونێکی تۆی ئازیز، ڕازی‌بوونی ئەو نادەم**

«بتی‌تۆ، ئەت پەرستم من. عیبادەت[16] بۆ خودا ناکەم
ئەگەر چی ئاگرو جومرەی[17] جەهەننەم بۆم لەکارابێ»

X X X

گوڵی چاوم ئەواخنکا، بۆ تومێکی ئاوی چاوت
دڵم خۆی حەز ئەکا بەندبێ ،لەگوڵزاری قژی خاوت
زەحمەتی هیچ نی‌یە بۆمن، بەخوێن ئاودەم گوڵی لاوت

«لەلای من فەرزە باست کەم. کە چونکە«.فلانە.»[18] ئاوت
ئەگەر مەتحت[19] نەکەم نابێ ،وەیا شەرتی وەفا نابێ.»

X X X

کە من وابم بەرامبەر تۆ! چۆنە ناپرسی لە حاڵم؟!
تەماشای ئێستاکە مەکە، تۆ گەش و من وەك زوخاڵم
لە ئاهی من[21] مەڵێ: ئێستاکە مناڵم

«بەلامانا کەنایەیت، باکی قەهری خوات نی‌یە زاڵم
زەمانە هەر وەهانابێ، هەتا چەند ساڵێ.. باوابێ.»

X X X

گەلێك وەك من، نەقدی عومری بە چاوت دا هەتا هەڵهات
بووی بە ـ ئەلحەق ـ کەچی نەتبوو رەحم بەو عالەمەی شەیدات
هەموو پەك کەوتەن و خەستەن. لەجێی تەهلیلەیە (هەیهات)

«بەچاوی مەستەوە هەستە، ئیشارەتکە لە مەخلووقات
بزانە ڕۆح لەبەر یەکسەر، ئەبینی ڕۆحی تیا مابێ!»

X X X

ئەو گۆڕانکاری‌یانەی لەنێوان دەستنووسی غەزەلەکە لەلای‌من و تێکستە چاپکراوەکەی شاعیردا هەن ئەمانەن.

1 ـ بەیتی یەکەمی غەزەلەکە نیوە دێری دووەمی لە دیوانی شاعیردا بەم جۆرەیە: (نەمام و عەرعەری کۆرپەش ....) لەدەست نووسەکەی لای من بەم جۆرەبوو: (نەمامی عەرعەری....) چاپەکەم بە لۆجیکی‌تر زانی بۆیە لای خۆم ڕاستم کردەوە.

2 ـ بەیتی دووەمی چاپ بەم جۆرەیە: (لە عالەم دا لەتۆ چاتر...) لای من بەم جۆرەبوو: (لە دونیادا لەتۆ جوانتر ....) دەست نووسەکەم بە چاکتر زانی‌و نەم گۆڕی.

3 ـ بەیتی سێ‌یەمی چاپ بەم جۆرەیە:
(هەموو چاو مەست و گوڵ ڕوومەت...)
دەست نووسەکەی لای من بەم جۆرە بوو:
(هەموو چاو مەست و ڕوومەت گوڵ....) نەمگۆڕی.

4 ـ لە بەیتی چوارەمی چاپ دا:
(... ئەمە ئەقڵم قبووڵ ناکا.)
لە دەستنووسەکە: (ئەمن ئەقڵم قبووڵ ناکا.) نەمگۆڕی.

5 ـ بەیتی پێنجەمی چاپ:
(کەوابوو تۆ لە شوعلەی نووری پاکی قودرەتی حەقی
ئەبێ جێگایی ئەسلێشت عەتارید یا سورەیابێ)

لە دەست نووس دا:
(کەوابوو تۆ لە نوتفەی پاکی قودرەتی حەقی
ئەبێ مەئوایی ئەسلێشت، عەتارید یا سورەییا بێ)
دەستکاریم نەکردو بەگوێی دەستنووسەکەم کرد.

6 ـ بەیتی شەشەمی چاپ:
(ئەگەر چی ئاگری جوملەی جەهەننەم....)
دەستنووسەکەم بە لۆجیکی‌تر زانی کە دەڵێ:
(ئەگەر چی ئاگرو جومرەی ...) نەمگۆڕی.

7 ـ بەیتی حەوتـەم لەدەست نووسـەکـەدا هەیـەو لە چاپ دا نی‌یە دەشێ شاعیر بۆ خۆ قوتار کردن لە بۆشایی جێگەی ناوەکە، فەرامۆشی کردبێ.

8 ـ بەیتی هەشتەم لە چاپ و دەستنووس دا وەك یەکن.

9 ـ بەیتی نۆیەم لەدەست نووس دا هەیەو لە چاپ دا نی‌یە، وەلێ من فەرامۆشم نەکردو نووسیم.

ئەوانـە جیـاوازیـکـانی نێـوان هەردوو تێکستـەکە بوون چ بە دەستنـووسی، چ بە چاپکـراوی. لە ئەنجـام دا ئەوەی بۆم ڕوون بووەوە ئەوەیـە کە: شاعیـر شارەزای ئـسـوولی غەزەلە کە وەك باوە پێویستە 7 ـ 9 ـ 11 بەیت بێ واتە تاك بێ بۆیــە کە ئەو بەیتــەی لابــردووە هەتـا خۆی قوتـاربکـا لە مەسـەلـەی ناوی شیعـر بۆ دانـراو، ناچـاریش بووە بەیتی دوایین وێڵ بکا تا ژمارەی بەیتەکان بەتاکی بمێننەوە.

هەروەها هەوڵی داوە چارەسەری دوو لایەن بکا:

یەکــەم: هـەنـدێـك وشـەی عەرەبی بکـا بە کوردیو دەستکاری‌یان بکا.

دووەم: بە گۆڕانکـاری‌یـەك ئەوە بپۆشێ کە غەزەلەکە بۆ (نێر)ە نەك (مێ).

شاعیر سەربەستە چۆن و بەچ شێوەیەك دەستکاری شیعری خۆی‌بکـا بۆیـە ئەوەی لە چاپی دیـوانـەکـەی‌دا کردوویەتی بەمافێکی ڕەوای خۆیی دەزانم بەلاّم منیش لەبەر پاراستنی مافی خۆم لە پێنجین کردنی غەزەلەکەدا، بەپێویستم زانی سەرنجی خۆم لەم ڕووەوە دەرببڕم هیوادارم شاعیری شیرین گفتـارو ناسـك عەلـی عارف ئاغـا بم بەخـشـێ و پێ‌ی دڵگـران نەبێ خوێنـەدەوا رانیش ڕازی‌بن لەم ووتـارەو ئەوە ڕەچـاوبکـەن کەئـەم باسـە دەربـارەی حاڵـەتێکی عیشقی شاعیرانەی 17 ـ 18 ساڵ لەمەبەرە.

پەراوێزی ماناپێویستەکانی پێنج خشتەکی‌یەکە:

(1) مەحبووب: خۆشەویست. لەدڵ دا شیرین. حوبێنراو.

(2) دەعواچی: خاوەن داوا. شکاتکەر.

(3) نیشانەیە بۆ چیرۆکی یوسف و زولەیخای ناو قورئانی پیرۆز.

(4) واتە لەخۆی ڕازی بێ. لەجوانی خۆی دڵنیابێ کە بێ‌خەوشە.

(5) تەقوا: پەرستش. خودا پەرستی

(6) زاهید: ئادەمزادی خاوێنی خۆ بۆ پەرستنی خودا تەرخان کردوو دوور کەوتووەوە لە تەماعی دنیاو خۆشی ژیان.

(7) تەقی: (ورع) خۆ لەگوناهـ پاراستوو.

(8) نەقی: (نقاء) خاوێن لەگوناهـ. پاك و بێ‌خەوش و لەکە.

(9) زیکر: باس کردن. بەیاد کردن (الذکر)

غافڵ: بێ‌ئاگا. ئاگالە خۆنەبوو.

(10) نوتفە: (النطفة) تۆوی پیاوانە.

(11) قودرەتی حەق: دەسەلاّت و توانای خودا.

(12) مەئـوایی ئەسـڵ: شوێنی لێ لەدایـك بوون. سەرچاوەی لێ ـ بوون و نیشتەجێ بوون.

(13) عەتارید، سورەیا: ناوی دوو ئەستێرەن.

(14) نوێژ، ڕۆژوو، سەرفیترە، زەکات، حەج.

(15) ئەدا ناکەم: جێ بەجێ‌ی ناکەم. نایکەم.

(16) عیبادەت: خودا پەرستی. پەرستش و پاڕاندنەوە بۆ خوداو لە خودا.

(17) جومرە: پشکۆ. سکڵ.

(18) ئەم بۆشایی‌یە لە دەست نووسەکەدا «ئەحمەد» نووسرابوو.

دەشێ شاعیر هەر بە بۆشایی دای نابێ و کەسێك خۆبۆخۆ ئەوناوە یان هەر ناوێك دابنێ بۆیە من لێرە وشەی (فلاّنە)م دانا.

(19) مەتــح: (مـدح) ستـایش. پێـدا هەڵگـوتن. پیـادا هەڵـدان. وەسف کردن بە دیوی باشەدا.

(20) لە ئاهی من: لە سزای ئەو ئازارانەی تووشت کردووم.

(21) خەتت دەریەت: مووت لێ‌دێ. ڕووت بە موو زبردەبێ.

# عەلی عەبدوڕەحمان

## شاعیر و نووسەری کوردی ئەرمەنستانی سۆڤێت

شوکور مستەفا

عەلی عەبدوڕەحمان مەمەدۆف، شاعیر و نووسەری کوردی ئەرمەنستانی سۆڤێت لە ڕێبەندانی ساڵی 1920دا، لە قەزای وانێ، لەگوندی «بایرەك»، لە بنەماڵەیێکی ڕەوەند لەدایك بووە.

لە هاوینی ساڵی 1926دا، لە تاو شاڵاوی زوڵم زۆرو قات وقڕی پاتشای ڕۆمی، 1500 ماڵە کوردی هۆزی «بڕووك» کۆچ دەکەن، پەنا دەبەنە بەر وڵاتی سۆڤێت. ماڵی عەبدوڕەحمان یشیان لەگەڵ دەکەوێ، دەچنەوێ لەو وڵاتە دەرووی ژیان وگوزەران و خوێندنیان بۆ وەسەرپشت دەخرێ، عەلی یە چکۆلەیش لەو ژیانە نوێباوەدا چاوهەڵدێنێ و وەروێرکە دەبێ.

لە ساڵی 1932دا عەلی عەبدوڕەحمان لە فێرگەی شەوانەدا خوێندنی سەرەتایی (سوختەیی) تەواو دەکاو هەر لەو ساڵەدا لە فێرگەی پیشەکاریی کوردی یەریڤان وەردەگرێ لەساڵی 1937دا ئەوپلە خوێنن یش دەبڕێ لە ساڵەکانی 1937 ـ 1941دا لە زۆرینەی گوندەکانی ناوچەی «کووتایکێ»ی کوردەواریی ئەو وڵاتە مامۆستایەتیی زمانی کوردی دەکا.

لە 1941دا، کاتێ شەڕی نارەوای فاشیستە خوێنخوارەکان شاڵاویان بۆ سەر وڵاتی سۆڤێت برد، عەلی عەبدوڕەحمان لە فێرگەی سەربازیدا دەخوێنێ لەپاشان دەبێ بە پێشمەرگە لە دژ ئەڵمانە هیتلەرییەکان دەچێتە جەبهەوەو هەم لەرادیۆ و هەم لە گەرمەی شەڕدا کوردایەتی دەنوێنێ کە چەند ئازاو چالاکە.

لەپاش شەڕ برانەوەو فاشیست ڕاونان، لە 1945دا لە مەعهەدی خ ئابوڤیان وەردەگیرێ، پاشان لە باکۆ لە کولیی یەی دنیازانی بەشی ئازر بایجاندا وەردەگیرێ و لە 1949دا خوێندن تەواو دەکا.

لە 1949دا دەبێ بەکارگێری فێرگەی ناوەندی لەناوچەی «باسارگێچار» لە جاقرلوو.

لەسای خەباتی دڵسۆزانەوەی، لە 1950دا دەبێ بە سەروێری بەشی خوێندنی هەموو خڵکی باسارگێچار. لە 1953دا لە وەزارەتی مەعاریف و ڕۆشنبیریی ئەرمەنستانی سۆڤێت دەبێ بەپشکنێر.

لە ساڵی 1955 ەوە تائێستا گەلێ وتار و چیرۆك و لێکۆڵینەوەو سەربهوردو ڕەخنەی ئەدەبی جۆربەجۆرو وەرگێرانی لە ڕۆژنامەی «ڕێیاتەزە»ی کوردەکانی ئەرمەنستانی سۆڤێت بڵاوکراونەوە.

زۆریش لەبەشی کوردیی ڕادیۆی یەریڤانەوە بڵاوکراونەوە.

لەساڵی 1957دا بۆ یەکەم جار بەشێ لە سەرگوزەشتی وێ «مۆرۆف» لە «نقیسکاریێ کوردایە سۆڤێتی یێ [نووسەرانی

کوردی سۆڤێت] دا بەرەفۆکێ تەچاپ دەدرێ بەڵام لەساڵی 1959دا کتێبی یەکەمی بەناوی «خاتێ خانم»ەوە لەچاپ دەدرێ هەر لەو ساڵەدا کتێبی «کور گەلی کورد هوشیارین» لە زمانی ئازەر بایجانی یەوە دەکا بەکوردی و لەچاپی دەدا.

لەساڵی 1961دا بەسەرهاتی وی لەکتێبی «عەفراندنی نڤیسکاری کوردێ سۆڤێتی یێ» [تەئلیناتی نووسەرانی کوردی سۆڤێت] بەناوی «دوو دلێ حزکری» [دوو دڵی حوزلێک کردوو] لەچاپ دەدرێ.

کتێبەکانی عەلی عەبدورەحمان، لێکۆڵینەوەکانی، رەخنەکانی، چیرۆکەکانی، شیعرەکانی، تەرجەمەکانی لە نێو خوێندەی کورددا زۆر بەتاسوقی دەخوێندرێنەوە.

تا ئێستا «خاتێ خانم» و «دێ» و «گوندی مێرخاسا» و چەند وتار و چیرۆک و شیعریم خوێندوتەوە، وەك تێی گەیشتووم! چونکە هەر لەمنداڵی یەوە بنەماڵەکەی لە زێرو نیشتمانی خۆی تەرە بووە، غەریبی و نامۆیی لەنووسینە ویژدانی یەکانیدا بەخەستی دەنگ دەداتەوە هەمیشە بەسۆزی ئەشقی کوردستانەوە گۆرانی دەڵێ. شیعرەکانی پڕن لە کوردایەتی لە نیگایەکی مرۆپەروەری وجیهانبینی یەکی گەشەوە لە هەرکوێ یەك بیستبێتی زۆرلە کورد دەکرێ بەپێی توانی لەسەری هەڵیدا وتێ.

ئەوەی لەم چەند دێرەدا بۆم نووسیوی، هێندەی بەبەرەوە نیە زۆرت بۆلەسەر برۆم، باوەڕەزت نەکەم، فەرموو شیعرەکانی و چیرۆکەکەی بخوێنەوە. جا هەنگێ بۆخۆت سەرپشك بە!

کوردستانا عەزیزرا

کوردستانامە، تو چقاسی شیرینی،
تو بۆ کوردا رۆنایا چەعفانی،
ناڤێ تە هەر دلەکیدا گولە.
چاوا خوون ناڤ د لدا دوخولخولە...
راستە، ئەزی چووك بووم لێ کال و باڤ
ور دبێن، خوون کشیایە وەکە ئاڤ،
لێ کوردا شەر کرییە مێرخاسی،
وەتەنێ خوە نەفرۆتیە تو کەسی
خوونخورا تو بریندار دکری،
ئو کۆکا ملەتێ مە دبری،
مالهەمبوونا تە ژی تالان دکر
دوور دسەکنی ب قەلف دکر.
ئەز لاوەکی کوردایی ناڤسەرە،
تاریقا تە دخوونم سەرانسەرە،
دل و هناڤێ من دیەرتە،
لەما ژی سوژدەدارم ئەز بەر تە.
ئو من خوانەی یە فەقییێ تەیرا،
ئەحمەدێ خانی، دەلالێ دلا،
مەلایێ جزیری ئو جەگەرخوون،
دل ـ هناڤێ من بوونە کاف وکوون.
ئەو نالیانە کالییانە ژ دەردا،
رێیا ئازایێ دانە مێشیا کوردا،
هەر شێرەکە وان بۆ مە ئۆجاخە،
تو قەوات تونە، ژ دلا دەرخە...
دلێ منی زەلوول هێسا نا بە،
قەلبێ منی رەشە قەت قەنج نابە،
سەبا تە قودوومێ من شکەستنە،
ئەز زانم کوردستان جییێ مێرانە.
کوردستان تو مەسکەنێ بوك ـ بەرانا،
تارییێ شەعدەیە بۆی وان تالانە،
کوشتنا مێرا، میراتبوونا مالا،
رەش ـ حەشێ ئو داغا دلا...
کوردستانامە، تو چقاسی شیرینی،
تو بۆ کوردا رۆنایا چەعفانی
ناڤێ تە هەر دلەکیدا گولە،
چاوا خوون ناڤا د لدا دخولخولە...

دێ
پێشکێشی دیبا خوە
ئامنا نەفلی دکم .

دلێ تە فرەیە چاوا عەسمان و بەعر،
بۆنا من ڕۆنایی ددە شەف ڕۆژ هەر دەر،
هێلەچانێ دحەژینی لووری دبێژی،
دەردێ کەڤن بیر تینی و درێژی

داییك، داییکا منە دەلالە ـ حەلال،
من ژ جوٚت کانیێ تە ڤەخار شیرە زەلال،
شیرێ تە زەلالە ـ حەلالە چا کەوسەر،
من ژ وان کانییا ڤەخاری‌یە سەرانسەر،
شەڤا تو بوویە ڕۆژ، ڕۆژا تە بوویە شەڤ،
تە شیرێ سپی نوٚلی جەوێ ئاڤ .

داییك، داییکا منە دەلالە ـ حەلال،
من ژ جوٚت کانیێ ڤەخار شیرێ زەلال .

ئەز پاشلا تەدا گڤرە ـ مەزن بوومە،
ئاقل کەمال ،گهیشتم ڤێ ڕۆژا مە،
ئەز ژی نوٚلی گشکا بەر تە سوژدە ددم .
بوٚی ئاقلو کەمالا تە عەمر ددم .

داییك، داییکا منە دەلالە ـ حەلال،
من ژ جوٚت کانیێ تە ڤەخار شیرێ زەلال،

دایکێ جان ! دنیاییدا تونە ئێ مینا تە،
من فرك ـ فرك ڤەخاری‌یە شەربەتا تە،
ئەز مەزن بوومە بن پەرو باسکێ تەدا،
بوٚرجدارم منەتدارم بن بارێ تەدا .

داییك داییکا منە دەلالە ـ حەلال،
من ژ جوٚت کانی‌یێ تە ڤەخار شیرێ زەلال .

ئەز حازرم بوٚی تە ڕوٚحێ تە فنێ کم،
چیا وەلگەڕینم، هەبوونا خوە ژی خەرج کم،
دیسا بەر ڤەنجی‌یێ تە شرین دەرنائێم،
مێزینا تە گرانە، ئەز گونەکار دەرتێم .

داییك ،داییکا منە دەلالە ـ حەلال،
من ژ جوٚت کانی‌یێ تە ڤەخار شیرێ زەلال .

بەنگیمە

ناخ ،چڤا باش بوو ڕوٚژێ بهووری،
ڕەختێ تو سەکنی بووی بەر دێری،
تە چەعف کلدابوو، بسك ژی بادا بوو،
فینۆیشماقی عەینێ گرێدا بوو.

هەما وێ ڕوٚژێ ئەز بوومە مەجنوون .
لەیلێ دلدا چەرخ ددا، چاوا خوون،
ئەزی کەسیەبووم، باڤێ نەددا،
میراتا کەسیی‌یێ دەرب من ددا. . .

بەلێ، تە گەلەکی من خر دکر،
ڕوٚنایا چەعڤێ خوەدا جی‌دکر.
لێ ترسا باڤێ تو درجفی،
تە بوٚی خەلقێ گرێ نەددا کوٚفی .

ئەز بوٚی حوبا بەنگی ـ سەرخوەشم،
ژ دەردێ تە بەدحالێ و نەخوەشم،
حەکیم ب خوە بە، لوقمان نکارن،
برینا منە خەدار ڤەنج بکن .

هەی نوور حویا من ،کەچکا دەلال،
دلێ مندا قیمەتلی، تو خەزال،
نادر، ملێ دنێ گشك نەلازمە .
تو بەدەوی چا ڕۆنایا سەر مە .

ئاخ، خەزال ،ئەزی بۆی تە نەخاشم،
سەودێ من تەڤ هەڤ بوو، ئەزی گێژم،
گونێ گشکا مینا مەجنوون بن تێ،
حەزار فکر تێ ئاقل و ،دەرتێ.

ئۆف، مالا سەبەبا بشەوتە،
ئەز شکێناندم، ڕۆحێم دشەوتە،
تو یەقین بزانبە ئەز مریمە،
ل بەر شۆیێ ،ئەز موحتاجێ تەمە . . .

کەچا کوردا

قیزا کوردا ،تو حوسولجەمالی،
تو دلێ مندا زەعف دەلالی،
بەژنا تە زراڤە، چا سپیندار،
ڤالچیچەکا کانی‌یا سەردار.

قیزا کوردا ،قیزا کوردا،
تو لەتیفا ئەشقا دلا،

ئەز بەنگیمە، تو یارا منی،
دەڤێ تە چووك ،دران مرجانی،
گولیێ یارێ گازو نیڤەك،
نۆلی کەسکەسۆر، رچان، گولەك.

قیزا کوردا، قیزا کوردا،
تو لەتیفا ئەشقا دلا

ل زۆزانێ مە کال و باڤا،
شەمال ددی تەر هیڤا شەڤا،
ئەز ئاشتم، تو قودوومێ من،
قەوەت تو نەبە مەری هێچن .

قیزا کوردا، قیزا کوردا،
تو لەتیفا ئەشقا دلا .

تەمام دنێ وێ یەکێ زانە،
بەدەوی‌یا کەچا کوردا عەیانە،
قیزا کوردا هیڤا بەکشەڤە،
شەمال گەش، چا ستێرك دەردکەڤە

قیزا کوردا ،قیزا کوردا،
تو لەتیفا ئەشقا دلا .

کەچا کوردا کارا خەزالە،
ئەو دلێ مندا زەعف دەلالە،
قیزا کوردا بۆی من عەمرە،
ڕۆحێ من شەڤ ـ ڕۆ وێ دگەڕە،

قیزا کوردا، قیزا کوردا،
تو لەتیفا ئەشقا دلا .
تو کەچا کوردا، ئەز کوڕێ کوردا،
ئەز بۆی تە دنالم ـ دکالم،
گەلۆ خوونا تەدا ناگەڕم؟

قیزا کوردا ،قیزا کوردا،
تو لەتیفا ئەشقا دلا .

### دلێ خەییدی

دلۆ، ئەڤا ڕاست چل سالە،
تو منڕا بوویی هەڤالە،
ئەڤ چل سالە، ئەم برانە،
مینا شرکا زەلال کانیانە.

سالا چل ـ یەکێ خەییدی،
تو من دبارینی هەر دەری،
دلۆ نە وا نابە،
تیرێ لێخستی قەنج نابە...

میرات، مەجالێ بدە من،
خاستنێ من هیِ گەلەکن،
یا پێشین شیرین کوردستانە،
مەسکەن، وارێ دێ ـ باڤانە.

دلۆ، دنیا هەیە بەعرەك،
لێ ئەم ئینان ناڤدا چلکەك،
ئەم ژی بینە خوەلی،
چێرێ سەر مە بگرە گولی...

دلۆ ئەز تە هیڤی ناکم،
بەنگزێ خوە پەریشان ناکم،
مرن هەیە ئەو عەدەتە،
ژ مرنێ ڕەڤ کرێتە...

شەڤ ـ ڕۆژ دنالم ـ دکالم،
دوختر ژی برینێ دل قەنج ناکن،
ئەز زانم، تێ من زوو بفرۆشی،
قەومێ بێنە مال سەرخوەشم...

ئالاڤا بەنگیتیێ

گولا من! مێزە بکە، ئەزی نەخوەشم.
بۆتە جۆت شەمامۆکا، ئەز مەست ـ بەدحالم،
ئەزێ بێفتیا ژ ئەڤێ دەردی بمرم،
من دەڤێ نەکن ئو ڕەشا ژی گرێ نەدن.
هەی یار وەرە، عەزیزا من، وەرە،
ئەگەر نکاری، بفرە وەرە.

مەیتێ من یەقین باڤێژنە چۆل و بەستا،
برا تەیرادە بخون دکێف کن ل ڕاستا،
برا یارام هەستوویا بینە دەرڤا،
بشەوتە، هێسر لێ بین جەوێ ئاڤا.
هەی یار وەرە عەزیزا من وەرە،
ئەگەر نکاری بفرە وەرە.

یارا من جانکەکە بەژن زراڤە،
چەعف ڕەشە، سوورەت خال و کەنی سەرلێڤە،
ئالییێ ئاقلڤا ئەو کەمالە تژی،
ئەو تەنێ بۆتا نەفسا جانێ من دژی.
هەی یار وەرە، عەزیزا من وەرە،
ئەگەر نکاری بفرە وەرە.

هەڤال ـ هوگرنۆ، ژ من لۆمانا نەکن،
ئەزێ دەربێ لێخستی ئیدی دەستەنگم،
لۆما من حەباندییە، ئەزی ئاشقم،
نۆلی مەجنوون ژ لەیلێ گەلەك حزدکم،
هەی یار وەرە، عەزیزا من وەرە
ئەگەر نکاری بفرە وەرە.

گوشتێم کرتك ـ کرتك ژێکن ئو ڤەخێرن،
هێسرێ من بینە چەم و کانی بکشن،
قازی ـ مەلله ڕوونێن، ڕووحێ من بستینن،
وەختێ یارێ دبینم قەت تەلاشی ناکم...

هەی یار وەرە، عەزیزا من وەرە،
ئەگەر نکاری بفرە وەرە.

دۆستا من، ئەز زانم تو ژ من حزدکی،
من رۆنکایا چەعڤێ خوەدا جیوار دکی...
لێ کییە، سەبەبێ ڤێ بەنگیننیێیا مە؟
سەبەب دنیایێدا قەت قەنجیێ نەبینە!
هەی یار وەرە، عەزیزا من وەرە،
ئەگەر نکاری بفرە وەرە.

**فەرهەنگۆك**

کوردستانا عەزیزرا: بۆ کوردوستانی ئازیز
چقاسی: چەند
رووناڵي: ڕووناهی، ڕووناکی
چەعڤ: چاو
چاوا: وەك
دخولخولە: دەگەڕێ، دەخولێ
ور: لێرە
دبێن: دەڵێن
کشیایە: کشاوە، ڕۆیشتووە
توکەس: هیچ کەس
کۆك: ڕەك وڕیشە، بنەڕەگ
مالهەبوون: سامان

ئاڤسەرە: سەرە، خورت
تاریق: مێژوو
لەمازێ: لەبەرئەمە
پەرتین: پسان
فەقییێ تەیرا: فەقێ تەیرانی شاعیری کورد
مێشی: مێشك
تونە: نیە

توقەوات: هیچ قەوەتێ
هێسانابە: ناسرەوێ، ناحەسێتەوە
قەنج نابە: چاك نابێ
سەباتە: لەبەرتۆ
قودووم: قەڵەمی ئەژنۆ
شەعد: شایەت، شاهید
دێ: دایك
فرە: فرەوان، گەورە
بەعر: بەحر
هێلەچانێ: هەلۆرك، جۆلانە
دحەژینی: ڕادەژەنی، دەهەژێنی
لووری: گورگانەشەوێ، لایلایە
کەڤن: کۆن، کەون
ڤەخار: خواردەوە، نۆش کرد
چاکەوسەر: وەك کەوسەر
تۆلی جەڤێ ئاڤ: وەك جۆگەلەی ئاو
نۆل: وەك
پاشل: پاشوێل، کۆڵ
گشك: گشت، هەموو
سوژدە: سوجدە
عەمر: ژیان
مینا: وەك تونەئێ میناتە: نیەئێوەکو تۆ، نیە هی وەك تۆ
فرك رفرك: مژ ـ مژ، فڕ ـ مڕ (لە فڕکردنەوە هاتووە)
بۆرجدارم: قەرزدارم
فنێکم: فەناکەم
دەلگەڕینم: هەڵگێڕیەوە
مێزین: چاوێری، تەماشاکردن، لێ نۆرین. مەبەست (چاکەدانەوەی دایك)ە
بەنگیم: ئاشقم، شەیدام
چقا: چەند، چەندە
بهووزێ: ڕابردوو
بەردێری: بەردەرکە

بسك : زلف

فینور شماقی : کلاوزەری‌زیو، کلاویکی ژنانەیە ، هی لای مەلاتیە زور بە ناووبانگە

عەنی : هەنیە ، نیوچاوان

کەیب : هەژار

حزدکر : حەزدەکرد،

کوفی : سەرپیچ

گری‌نەدداکوفی : سەرت نەدەپیچا .

بەدەو : جوان

چارووناياسەرمە : وەك روژی سەر سەری ئیمە

نەخاش : نەخوش

بشەوتە : بسووتی

ئەزشکیناندم : تیکی‌شکاندم، برستی لی بریم

بزانبە : بزانە

زەعف : زور، فرە

زراف : ڤەدباریك، بەژن شووش و باریك کەمەرەشل

چاسپیندار : وەك ئەسپیندار

قالچیچەك : گولووك

چووك : چکولە

دران : ددان

گولی : کەزی، پەلك

گازونیڤەك : گەزونیوی

کەسکەسور : کولەکەزیرینە، پرچی ئایشەو فاتمە. قەوسی‌وقوزەح

هیڤاشەڤ : مانگەشەو

تونەبە : هیچ نەبی

دنی : دنیا

عەیان : ئاشکرایە

هیڤایەکشەڤە : مانگی یەکشەوە

گەلو : ئایە؟ توبلیی، داخو، کورینە، ڤەومیل، گەلی براینە .

دلی خەییدی : دلی زیزووویر، توورە، توراو

شرك : تنوك، دلوپ، چور

تیری لیخستی : بەتیرئەنگاوتراو، جیی تیر چانابیتەوە قەنج نابە

وار : زید، نیشتمان، مەفتەن، هەوار

چلك : تنوك، دلوپ، قەترە

خوەل : داری‌کفر، تەروو، تیروو

بەنگز : رەنگ وروو

رەف : هەلاتن

کریتە : دزیوە، ناشیرنە، عەیبە، فهیتە

ئالاتی : گر، هالاو

بەنگیتی : ئەوین، ئەڤین، عەشق، شەیدایی

میزەبکە : بنورە، براوانە، سەرنج بدە،

بیفتیا : بی‌گومان

رەشاگری‌نەدن : رەش نەپوشن

تەیرەدا : تەیروتوو، پەرەول ،پەلەوەر، تەیروتووال، مەل ومەلچك

برایارام هەستوویا ببینە دەرڤا : با برینم ئیسکی دەرکەوی

یارا : برین

هەستوو : ئیسك

هیسر : روندك، ئەسرین، فرمیسك، عەسر، ئەشك

کەنی : خەندە، بزە

کەمال تژی : عەقل پر، ژیر

بونا : بو، لەبەر

تەلاش : پەشوکان، شلەژان

جیوارکرن : هیوراندن، جیگاکردنەوە

•

بەردیلی «ژن بە ژن»

ئیڤـــار بوو. تاری کەتبـــوو عەردی. پرە میـــروژ ن بەرب مالا چەرکـەزی جینـار دچـوون بیسـتـەکی شوندا ئەو گهیشتنە مالا جینـاری خوە. دە ب قانـوونـا میڤـا نحـزی‌یـا کوردا ئەو هاتنە قەبـوولکـرنی ئوسەڤا وان پەزەك هاتە سەرژیکرنی ، وەکی ئەو وەختی خوە باش دەربـــازبکن. چەرکـــەز دوو روونشتـانـدنـا

مێڤـاپـزا ل وان نهێـری ئو ئیبـراهیمێ رووسپی ل ڤێزا گشکادا روونشتی مێزەکر، تەیێ قەی بگۆتا تشتەك نقتی دلێ وی ئو گۆت :

ـ ئیبراهیمێ برادەر ئو مێڤانێ هاتی ، هوون ڤێ شەڤێ ژ وورا حەتـاڤـرا سەر من ئو چەعڤێ من هاتنـە : دە ، گەلی برا ، چاوا جمـاعـەتـا مە دبێـژە ، مێڤـانێ شەڤێ ، ژکیسێ خوە دخو. وە وەختێدا سەڤا هاتنا خوە عەلامەتی نەدایە من ، هوون نشکێڤا هاتنـە مال ، گۆتن هوون ئیشـەڤ ژکیسێ خوە بخـون ئیشەڤ خەرج گەرەکـێ برێ مـن ئیبـراهیم بکشینـە ، چمکی ئەو گەلـەکی تمـایە گەلی لاو ، هوون وی دقەومە رند ناس ناکن ، لێ مە سالێ درێـژ ب هەڤـرا هەڤـالتی کرییـە ، ئەمـە هەڤرو بەلــەدن وەختێ ئەم وێ رۆژێ چووبوونــە مالا برایێ خوەیی ئیبراهیم‌راستە وی مەرا حورمەتەکە زۆرکر، لێ یەقین ئیرۆ ئەو هاتی‌یـە حەیفـاخوەیە وێ رۆژێ ژمن بستینە ، دەتشتەك نابە ، برادارێ هەڤن .

ئەڤ خەبـەردانـا چرکـەز هنـەکی ل کێلەکـا ئیبـراهیمێ رووسپی دکـەت ، لێ خاشـامەرڤێ روونشتی دهات وب وی دکـەنییان وەختێ جماعەت ب وی دکەنییا هێرساوی گەلەکی دهـات ، خوەدا دوەرمی ، دقجقجی ، تەمـارێ ستوویێ وی‌یە زارف دوەرمین ، تەیێ قەی بگـوتـا ئیبـراهیمێ رووسپی هەلا جابا وان پرساحازر دکە، وەکی جانبە ئوسا بدە چەرکەز، گولە ژی کیژانێ رندتر بوو، لێ نەدبوو، سافیکرنا پرسەکێ هەبوو. . .

دەمـەکێ شونـدا ژنێ مێڤـانـە هاتی ژ ی ، هاتنە ئۆدا مێرال کونجـەکی روونشتن ئۆدێـدا هنـەکی ستەقراندن پێشداهات ، توکـەسی خەبەر نەددا هیڤا هەوالدانا ئیبراهیم سەکنی بوون ، وەکـی ئەو خەبــەردە ، لێ ئەوزەعـف ئارخــاییـن خییێ خودا روونشتبوو، تەیێ قەی بگۆتا هاژ بایێ دنێ تونەنە ، قەت خەما وی‌رنین بوو ناڤا وێ ستەقراندنێدا چەرکەز گازی ژنا خوەکر:

چیلێ ، چیلێ !نـەئاخر ،مێڤان زوودا هاتنە ،نها برچینە ، خورەکێ تەبــووچ ؟مـالاڤـایێ ، زووبکـە ، یانێ ئیبـراهیمێ باشێ بدە روویێ من .

راستـە ، ئیبـراهیم هێـرس بووبـوو، لێ چـار ئونـاچـار ئەو هنەکی بن سمێلاڤا ڤەبشری ئو پاشێ تزبییا دەستێ خوەدا کرە چەرخێ گۆت .

ـ گەلی مێڤانا ، قەت لەز مەکەڤن ، ئەز سالا ـ مەهاجارەکێ هاتمـە برانگێ خوەیی چەرکـەز، ئابجـاح وی سەرێ پەزەکـە خوە سەرژێکـرییـە ، ئەوژی هوون من ددنـە لەزکـرنێ جا وەلەه، ئەز دەرهەڤا مەخسەدا خوەدا نافکرم، چکی من ئێڤارێ مال شیق رنـد نەخارییە ، ئەز ئیڤا پاشیڤا مالا برانگێ خوەمە قەت لەزکەتن نەلازمە .

ژنێ خازگینچی گلی ژ دەڤێ خوە پەکـانـدبوون، مەلەکێ ژ ی بهستبووئاگر ـ ئالاف بەدەنا وێ کەتبوودشەوتی ئۆدێدا ئەو ب گاڤێ فرە بێ‌حـەمـادی خوە دچـوو ـ دهات بەرچەعڤێ وێ بووبـووتاری ، هێـسـرێ وێ مینـا بارانـا مەهـا گولانێ سەر سوفـەتێ وێ‌یـە ئەلجەوازیرا دباریان ژهێرسا خوە تە دگۆت ئەو کەتی‌یـەبـا ـ باگـەرا مەها سڤاتێ بارگـەرێ رییا پاشالخە پێشییا دبـەچنی ، بەر وێ‌رێ دهـاتـە گرتنێ ، وێ سەرشەپێ بەرفێیە مەزنـرا گاڤ دکـر ئو جارنـا عەردێ دکـەت ، هۆل دبوو، دیسا رادبوو قەواتا خوە بەرەڤ دکر، دخوەست پێشدا هەرە .

ئەز ژسور ـ سەرمابێ ئینسافە وێ مەهێ دجەمدی ، تامارێ لنگێ وێ‌رەق دبـوون ، ئیمکـانـا پێشدا چووبینێ نەددا وێ ، وەکی ئەو ئۆغـرا خوە بجـەعـدینـە کەزی‌یێ وێیـە درێـژە تەر کلێ ئیسپسحانێ بۆبە لیسکا مەها ئادارێرا دکەتە قال ـ شەنگێ ، لێ دیسا پێ نکاربوو، دهاتە ئالتکرنێ . بێ زەخم کەزی ل دێمێ وێ‌یی چیلیفەرقاش دخست ئوجارنا تە دگۆت کەزی وێـرا دبـوونـە ستـار ئو دخـوەزن وێ ژ بـایێ هاربوویی بدەخا ییکـرنێ حەڤتێرەنگێ سەرێ مەلەکێ مینا گەمییا راستی ئۆڤانێ هاتی ئاڤێدا درەقسی ، ئیمدادا ئازار بوونێ دخوەست وەکی ئەو وێ شەڤێ نەخـەنقـە ، نەبـە خورێ حەیوانێ بەیانی ئومەرڤێ نەباك لێ نەدبوو، ئەو کەتبوو دەستێ تەیرێ سیمر، ئەوبلیندی ناڤـا هەوێ دکـر ، ژۆردا بەردا ، ئەول شەلا ـ یـەلا دخست، چاوا گەڤرەك هۆلی نەوالەکە بێ سەرییە ـ بێ‌بنی دکر، پترك ـ پتـرکی دبوو، دەنگێ وێ‌یی زیر مینا رەفێ قولنگێ بەهارێیی

ژ بەری یێ هاتی بەلایی حەموو جییا دبوو ئو بیستەکێ شوندا دهـاتنە برینێ، توئیمداد نەدگهیشتە وێ، بێخایی بێخودان سەرێ خوە هلدابوو دچوو، کر دچوو.

هنـەکی شونـدا سڤـرەکـە دەولـەمـەنـد بەر میڤـانـا ڤەبوو، توکـەسی نەدخـار، هیڤـا ئیبـراهیمێ رووسپی بوون، بێ چ دبێـژە، پاشێ نانێ خوە بخـارانـا ئیبـراهیم تاسا خوٚرەکێ پارا خوە بەرب خوەکشاند، خاست بخوە، لێ ل چەرکەز نهێری ئوگوٚت:

برادەرێ چەرکـەز! ئەڤـا ئەپێجـە وەختـە ئەم هاتنە مالا تە، توقەت نەبێژ ی هوون سەڤا چ هاتنە؟

ڤێ شەڤـێ چ وە قەومـی یــە، هوون هاتنـــە مالا من؟ مالا تەئـاڤـابـە، تەژ ی مینـا منـەوە ختـەکێ کری‌یە، هەما دخازی «حـورمـەتێ» بکن دەمـەرڤـایـا مەژ ی هەیـە، ئەم ژ ی دکارن مێڤـانـــارا حورمـــەتێ بکن ئورنـد ژ ی ڤەرێکن. نـەئـاخـر تەگەرەکێ بگوٚتا هوون چ قەوی هاتنە؟.

- ئیبراهیم برێ من، - چەرکەز گوٚت، - ئەز تو، ئەم زوودا هەڤ ناس دکن، خەلق هەودزانـــە ئەم برێ هەڤن، لێ بـەلێ، وەلـــەهـە نڤینـا مەیـە شەڤێ ژهـەڤ باشڤـەیـە. برامێڤـانێ روونشتی بباخشینن، ئەز هەلا لاڤردی یێ خوەیە جاهلتی‌یێدا بیرتینم، لوٚبێ‌ئیمان، نەئاخر مەهەلا جاهلتی‌یێدا دەرهەڤا وێ پرسێـداب هەڤرا خەبەردایە نها ئیدی توچما رووڤیتی‌یێ هنەك چەتنـایی هەنە، دووخارنێرا ئەمێ بدنە زەلالکرنێ دە، هوون سەرێ من کن نانێ خوە بخـــون، لوٚ- ئیبـراهیمێ رووسپی تە دگـوٚت، وەکی ئەڤـا چەنـد حەڤتیێە نان نەخاری‌یە، یانێ ژ ی وەلاتەکی خەلایێ هاتییە مالا «برانگێ» خوە ئیبراهیم ئالیکێدا دەستێ خوە ئاڤیتە فەراقێ ئو ئالی‌یێ مایندا گوٚت:

بیسمیـلاهی رەحمانی رەحیم! دەگەلی لاوکا، کەرەم کن نانێ خوە بخـون عەفـەرم چیـلا خوشکـرا، خـورەکەکی ئوسا چێکـری‌یـە، وەکی مەرڤ پێـراتلی‌یا خوە دخوە، لێ پیرا من . . دە، گەلی لاوکا، کەرەم کن.

خێلەکە خورت شوندا مێڤانا نانێ خوە خارن شوکور بوونا خوە ئانین، رازی بوونـا خوە عەلامی مالخـــویێ مالێ ئوگــە کەڤـــانـیێ کرن، ئیبـــراهیم ئاڤ ژچیلی خوەست، ئاڤ ئانی، وی ڤەخار ئو گوٚت:

- چیلێ، دیا من! تەچما زەحمەت کشاند، ئاڤ ئانی، لێ سڤکا ل کویە؟ یەقین ئەرم دکە، ئاڤێ بینە، ئەرێ؟ نە ئاخر ئاڤا دەستێ وێ رەعفە شیـرنـە، خوت ئاڤـا زمـزمکێـیە، مەرڤ ڤەدخوە پێرا جاهل دبە چیلی، ئو سەرێ من کی، شەربەك بدە مەلـەکـا قیـزا براب دەستێ خوەمنـرا ئاڤێ بینە، وەکی ئەڤ خوەزتێ تەیی ب ئەعم، ل من بکڤرە

- مالا باڤێ تە نەشەوتە، - چیلێ گوٚت، - ئو دەست ژکرنی خوەیـە جاهلتی‌یێ نەکشـاندی‌یە. تویی ئیدی کالی، هنەکی خوە گران بگـرە، بـرا جاهـل مەعـریفەتی ژتە هلدن چ فرقی هەیە، من ئاڤ داتە، یانێ مەلەکێ. .

- دە، وەکی ئوسانە، ئیدی ئاڤ نە لازمە، بەسە، ئیبراهیم گوٚت، - چەرکـــەز، تو سەرێ من کی، وەرە جەم (بــرانگێ) خوە روونێ، ئەم چوٚکێ خوە بکوتنە چوٚکێ هەڤ ئوب هەڤرا خەبەردن . . .

چەرکـــەز هات جەم ئیبـراهیم روونشت هنـەکی ب هەڤ شابـوون، روٚژێ جاهلتی‌یـا خوەیـنە دەربـاز بوویی بیـرانین، کـەنی‌یـان، ب شرینـایی نئوچك هەڤروو خستن ئو ئیبراهیم ب دێمەکی گەش وا دەست ب هەوالانا خوەکر:

- چەرکـــەزێ برا! ئەم ڤێ شەڤێ سەڤـا پرســەکێ هاتنـە

هەلبـەت، جمـاعـەتـا روونشتی قـەوم - پسمامێ مەنە، تو کەسێ خەریب تونـــە ئەم ئیـروٚدلی خوە بەر هەڤ ڤەکن تە چەنـدەکی پێشـدا فرا خەبەودا ئو چەند روٚژ پێشداتو ئو خوشکا چیلێ هاتبـوونە مال، بوٚنا دەستگرتنا بەلگا من چەرکەزێ برا! من بهیـستی‌یــە، وەکی بەلگێ ئوکنیـازێ کورێ تەژ هەڤ حزدکن من ئەوپرســا پاشـــدائێخست، توگلی نـ ـداتـە ئومن گوٚت، - ئەزێ پاشێ جابێ بدمـەتـە، یانێ ئەمێ بێنە مالاتە. ئاهـار روٚژا ئیـروٚیین ئەم هاتنـە مالاتـە ئەز ئو قەومێ مەڤا هاتنە سەروێ نێتێ وەکی ئەم دهـانێـزیکی هەڤ ببنە قەومێ هەڤ، مەرا لازمـە ئەم قیـزێ خوە بکنە بەردێلێ تو قیزاخوە بدە کورێ

من، ئەز قیزا خوەب حەلالی یا خوەدێ بدمە کورێ تە. دەسلۆیێ کورێ من ژی، ژمەلەکا قیزاتە گەلەکی حزدکە ڤێ شوغولیدا نەئەز قەلەند ددمەتە، نەژی توددیمن. مەسەلا جماعەتا ئادربێجانە، دبێژن: ـ «دووسەری شەکر، مەللەك ئوسێ مەنات پەرە، خلاز بوو چوو». [illegible] کەزێ برا ئوخوشکا چیلێ؟

فکرا خوە دەرهەقا ڤێ پرسێدا چیە؟

چەرکەزێ برا، وەڤاعەیانە، وەکی بەردێلیتی شەریعەتا ملەتێ مە کورددا هەیە ب تەخمینا من، ئیدی دەرهەقا وێ یەکێدا فکرکرن نەلازمە، ئەڤ یەکا بوویە عەدەت، کەتی یە ناڤامە.

دووهەوالدانا ئیبراهیم ڕا دلەك پش دێری بێ تاقەت، بێ ئیدئیمداد ئوبێ حەمدێ خوکەتبوو چەرخێ دلکێ وێ مینا چنگینا سعەتاژ ئەدوودێ خوە دەرکەتی دکرەچنگینی تەبێ قەی بگۆتا ئەو چنگیا ستەقراندنا ئۆدێ ددە تەرباندنێ ئودبێژە، ـ بەلێ، کنیاز ئو بەلگێ لایقی هەڤن، ژهەڤ خردەکن، سەر هەڤ بوونە بەنگی، برا هەدوو دل ب مرازێ خوە شابن هەلا زێدایا سەر جاهل ئو ئاڤهلێ گوندێ مەڤێ یەکڕا ڕازینە، وان بمبارەك ئو پیرۆز دکن، لێ ئەزو سلۆ. ئەم نەلایقی هەڤن، حزکرییێ من هەیە ئەز ژ سلۆ حزناکم، ئەو ژی یەقین ژمن. ئاخی چماوا دکن؟ نەجماعە تامە کوردا وەختێدا گۆتی یە:

«کی ئۆرتا دوو دلێ حزکری خەبەردە براعەزیزێ بەر دلێ وان بمرە»، گەلۆ ئەو مەرڤێ ڕوونشتی وێ مەسەلا جماعەتا مە نزانن، یانێ بیرکرنە؟.. دایکا من هاژ ئەڤینیتیا من هەیە، گەلۆ ئەوژی وێ باڤێ منڕا ڕازی بە؟ نەئاخر بەردێلیتی دلێ حزکری ژ هەڤ ددە ڤەپە سراندنێ ئو ژ هەڤ دقەتینە. سەبا من...

چەرکەز کەتبوو ناڤا متالا، جارجارا ل حەلالا خوە دنهێری، تەقەی دزانبوو، وەکی ئەو ڕازی بوونێ دخوەزە ژ وێ بستینە، لێ وێ توچابا خێرێ نەدستەند، دوو گەلە فکراڕا چەرکەز گۆت:

ـ ئیبراهیم، تو کومێڤا سەر چەعقاڕا هاتنە، لێ بەردێلیتی تیشتەکی خرابە. حەتا نها توکەس ژ وێ یەکێ خێر نەستەندییە تشتەندییە ئوب وێیەکێ شانە بوویە ڕاستە، ئەزو توڤێ یەکێدا خەرج نەکشینن براجان! یاقەنج ئەوە وەرە ئەم دەست ژ ڤێ یەکێ، تو قیزا خوە بدە کورێ من، چمکی..

ژخەبەردانا چەرکەز، ئیبراهیمی ڕووسپی جارا هێرس بوو ئوگۆت:

ـ حەتانها تەدگۆت، ئەزڕازی نەدبووم، لێ نها ئەز ڕازیمە، تو نەڕازییی، ئەرێ؟ دە، گەلی لاوکا ئوحەرمەتا ڕابن ئەم هەڕن! چەرکەز، ئووێ یەکێ ڕند بزانبە، وەکی ئەڤ پرسا تەسەرێ خوە ناگرە، مرن هەیە لێ خوەستناتە نایێ سمێری. دەڕابن ئەم هەڕن.

ـ ئیبراهیم، چەرکەز گۆت، ـ وەیلێ عەجەك لێ کەتی، کوڕۆ، ئاگر ژ تەدبارە، مەرڤ نکارە تەڕا خەبەردە. هیلا هندکی بسەکن، ئەز ژی کولفەت ئو قەومێ خوەڕا خەبەردم، پاشێ ئەزێ جابێ کوتاسیبێ بدمەتە، وی چاخی کودا دچی هەڕە...

ئیبراهیم ئو دەستا خوەیە هاتی هنەکی شابوون، پاشێ هەرکەس جیێ خوەدا ڕوونشتن خێلەکە خورت چەرکەز ئو مەرڤێ خوەڤا نەهاتن، دهاتە کڤشێ هەوالدانا وان درێژ کشاند کنیاز خوە بەلێ گرتبوو «مرن ئو ژ بینا منە سەر بەلگێیە» کەسەکی نەڕازی بوونا مەلەکێ دەوسا تشتەکی حەساب نەدکر. دەمەکێ شوندا چەرکەز ئو قەومێ خوەڤاژ خێنی هاتنە ئۆدا مێڤانا ئو ڕازی بوونا خوە عەلام کرن وێ شەڤا تاری بەلگێ بە ردێلییادا هاتە کرنێ دەنگێ بمبارەك ئو پیرۆز بوونێ بەر دەرگێ دوو مالا دهاتە گۆتنێ. وێ شەڤێ خوە نە دکەتە چەعڤێ مەلەکێ وێ چ دکاربوو بکرا، خوە ژی نزانبوو..

زڤستان بوو ژ سەرەمێ چرکا ـ چرکا عەردوعەزمین بوو چیا ئوگەلی ئوڕاست ب کراسێ سپی یی چیلی قەرقاش هاتبوونە خەملاندنێ دەعوەت بوو، د گۆڤەندگران دەگەرییا دەنگی شاباشێ ناڤا هەوێدا پێل ددا، ڕازی بوونا دەفچی ئو زوڕناچییا دهاتە بهیستنێ دەمەکێ شوندا بەردیلێ پەیاکرن دەست ب خارن ـ ڤەرخارنێ، بمبارەك ئو پیرۆز بوونێ بوو دوو دەعوەتێڕا دوودل ئو چارچەعڤ هەڤ شابوون دگۆت گهیشتنە مرازێ خوە، لێ دوو دل ئوچار چەعڤ هەڤڕا کە تبوونە دەعو-

دۆزا هەرتیمی

مەلـەك دوو دەعوەتێرا سەر کانییا بنەتارا گوند حزکری‌یێ خوەرا

رەڤی ئو گهیشته مرازێ خوه لێ گەلۆ کنیاز ئو بەلگێ؟ . . .

### فەرهەنگۆك

بەردێلی: ژن بە ژن

تاری: تاریکی

جینار: جیران، دراوسێ، هاوسێ، هامسایە

بیستەکێ شوندا: پاش بستێ، هەردوای نەختێ

مێڤانخری: میوانپەروەری، میواندۆستی

سەڤاوان: لەبەر ئەوان (سەڤا = سەبا =لەبەر)

دربارکرن: رابواردن

روونشتاندن: داکردن، دانیشتاندن

نهێری: نواری نوری، روانی سەیری کر، تەماشای کرد.

رووسپی: رۆین سپی، ریش چەرمگ

فێز: سەروو، بنەبانێ

مێزەکر: دیتی، مولاحەزەی‌کرد

تەیی قەی بگۆتا: هەردەتگوت، وەك بلێی،

نقتی: دلۆپایە، تکایە ناو

ژورا: لەوێوە

تاڤرا: تائێرە

وە: ئێوە

وەختێدا: لەوەختدا

عەلامەت: خەبەر

نشکێڤا: لەناکاو

گەلی لاوکا: کورینە، گەلی لاوینە، لاوەکان، کورگەل،

هەڤالتی: هاورێتی، هاورێیەتی

هەڤرا: پێکەوە

هەڤرو: لە یەکتر

حەیڤاخۆ: تۆڵەی خۆی

برادار: برادەر

هنەك: هەندێك

دکەنییان: دەخەنین، پێ‌دەکەنین

کیژان: کیهان، کامیان، کامینیان

رندتر: شۆخ تر

خەبەردە: قسەبکا

ستەقراندن: قرەوبرە، قیرەوهەرا زریکەزریك

هاژ بـایێ دنێ تونـەنە: هۆشیان بە دنیاوە نیە، فریان، بەدنیاوە نیە ئاگایان لە دنیا نیە.

هاژ: هۆش

نها: نهۆ، ئێستا، نووکە، هەنووکە

برچی: برسی

ڤەبێری: بزەی هاتێ، گوژایەوە

برانگ: برا

سەرژێکرن: سەربرین، کوشتنەوە

هوون: ئێوە

لەزکرنێ: پەلەکردن

وەلەهـ: وەڵڵا

شیڤ: شیو، شێو، نانی ئێوارە

رند: چاك

خازگینچی: خوازبێنی‌کەر

گاڤێ‌فرە: هەنگاوی فرەوان

بێ‌حەمادی: بێ‌پشوو

سوفەت: سفەت (شێوە) (فرمێسکی وەك ارانی قایمی دەشتی عادیلجەواز دەباری)

ئەلجەواز: عادیلجەواز (ناوی شارێکە لە کوردستانی تورکیا).)

هێرس: توورەیی

سڤات: مانگی رەشەمێ (شباط)

باگەر: رەشەبا

پاشالخ: دەرەتان

پەچنین : تەنین
شەپ : هەرەس
گاڤ کرن : هەنگاوهەڵێنان
هۆل دبوو: حۆل دەبوو، گێژدەبوو
بەرەڤ کرن : کۆکردنەوە، خڕکردنەوە
تامار: دەمار
جەعداندن : تاقی کردنەوە
ئۆغر: بەخت
ئیسپیحانی: سوبحان کلی سوبحان
بوبەلیسك: زریان، بای بە بەفرەوەی زۆر قایم!.
قال‌شەنگ : بەرەنگار

ئالنکرن : بەزین
چیلیقەرقاش : سپی
خابینکرن : پاراستن
دێم : دەم وچاو
حەفترەنگ : سەرپۆش

گەمی : کەشتی
ئازابوون : ڕزگاربوون
نەخەنقە : نەخنکێ
سیمر: سیمرخ، باڵندەیەکی ئەفسانەیی یە،
هەوێ : هەوا، ئاسمان
کەڤر: بەرد، خڕك، گاشە
ڕەف : پۆل

خور: خۆراك
بەیانی : وەحشی ، کێوی
زیز: باریك ، نووزە
بێخایی - بێخودان : بێخێوویێ کەس
هنەکی شوندا : پاش قەدەرێ
هیڤا ئیبراهیمێ ڕووسپی‌بوون: چاوەڕێی ئیبراهیمێ ردێن سپی‌یان

دەکرد، بەهیوای بوون
پار: بەشی
ئەپێچە : زۆرچاك
ڤەڕێ کن : بەڕێی کەین
هەڤ ناس دکن : یەکتر دەناسین
هەودزانە : هەموو دەزانن
باشقەیە : جیاوازە
بباخشینن : ببەخشن ، ببوورن
لاقرتی : لاقردی، قسە ، دەمەتەقێ
جاهلتی : منداڵی
ڕووڤیتی : فێڵ
زەلالکرن : ڕوون کردنەوە
پرس : مەسە ، پرس ، پرسیار
سافیکرن : یەکلاکردنەوە ، یەکچاو کردنەوە ، ساخ کردنەوە
چەتنایی : چەتوونی ، سەختی ، دژواری، کێشەوبەرایەتی
دووخارنێرا : پاش خواردن
سەرێ من کن : بەقسەی من کەن ، بە گوێی من کەن
خەلا : غەلا ، گرانی
ئالیکێدا : لە لایەکەوە

مایین : دیکە ، تر
کەرەم کن : فەرموون
تلی : قامك پەنجە

مالخۆ: خانەخوێ ، خاوەن ماڵ
سڤك : سووك (شکا ماڵی) لەش سووکی ماڵێ
بەرهەڤ ڤەکن : بۆ یەکتر بکەینەوە
چۆکێ خوە بکوتنە چۆکێ : ئەژنۆی خۆمان بەئەژنۆی یەکەوە بنووسێنین .
دێمەکی گەش : ڕوویەکی گەشەوە

.دەستگرتنا بەلگا من : بۆ داخوازی بەلگێی من (بەلگێ) ناوی کێ ەکەیە .

ئیرۆیین : ئەورۆکە ، ئەمرۆکە .

ئه ۰ (۱) ۰ای عەتفە

بەردێل : مقابیل ، کف ، بەمانا (کاوریش) هاتووە .

قەلەند : مارەیی

مەنات : ناوی پارەی ئازەربایجانە

مەللە : مەلا

وەڤاعەیانە : لێتان ئاشکرایە ، لێتان عایەنە .

ئەڤ یەکا : ئەوە

هەوالدان : قسەکردن

چنگین : چرکەی سەعات

تەرباندن : بێ دەنگ کردن ، ڕەت دانەوە .

ئاڤهل : خەڵك ، ئەهل

ئۆرتە : نێوان

بیرکرنە : لە بیریان چووەتەوە

ڤەپسراندن : لێك پچڕاندن

مقالا : موتالەعە ، بیرکردنەوە ،

حەرمەتا : بەرێزینە

ڕابن : هەڵستن

نایەسێری : سەرناگرێ

عەجەك لێ کەتی : دەست لێ وەشێندراو

کولفەت : کابان ، ژن ، خێزان

کوتاسی : کوتایی ، (قطعي)

خێلەکەخورت : قەدەرێکی تەواو

دهاتەکڤشێ : وا دەر دەکەوت

خوەبەلێ گرتبوو : پێی داگرتبوو

خێنی : خانوو

سەرەم : سەرما

عەزمین : ئاسمان

خەملاندن : ڕازانەوە ، ڕازاندنەوە

گوڤەند : شایی وداوات

دەفچی : دەهۆڵ کوت

پەیاکرن : دایان بەزاند

دەعور دۆز : فرتدوفێڵ

پێل ددا : مەوچی دەدا ، شەپۆلی دەدا

گلی پەکاندن : قسە درکاندن

ئۆغرا خوە بجەعدینە : بەختی خۆی تاقی کاتەوە

نەوال : نەواڵ ، دۆڵی قووڵ ، شێوی قووڵ

گلی نەدا : قسەت نەدا ، گڤتت نەدا

له‌سایه‌ی ئالای شه‌کاوه‌ی سه‌ره‌کی فه‌رمانده

صدام حسین داوشه‌ی کوردی گه‌شه

ده‌سێنێ و پیرۆزتر ده‌بێ . .



# رۆمان نڤێس .. یەشار کەمال

● اسماعیل ابراهیم بادی ●

توڕێ تورکی تورەکێ بەرفرەهە مینا توڕێ هەمی جیهانێ، هەر وەسا ئەو ژی دبیتە چێ وتا. . دەمێ مرۆڤ ل سەر بەرپەرێت توڕێ تورکی دئاخفیت مرۆڤ نزانیت کیش نفیسەڤانی بکەتە جهێ پێئاخفتنێ، چنکو گەلەك نڤێسەڤان ژێ رابۆینەو هەرئێك ژ یێدی خورت تر بویە.

دناڤ توڕێ تورکیدا گەلەك نڤێسەڤان هەنە وەك: سەمیم قۆچەگوزو فەتحی ناجی وعەزیز نەسین و نازم حکمەت و یەشار کەمال. . وگەلەکێت دی، لێ یێت ژهەمیا پێش کەڤتی تروژخو دەرکەڤتی نازم حکمەت و عەزیز نەسین ویەشار کەمالن، نازم یەکەمین کەسە ب هۆزانا خوو عەزیز ب چیرۆکێت خویێت [کومیدیو واقعی - ریالزمی] و یەشار ب رۆمانێت خو یێت دەنگە و ناڤێ خو ل جیهانێ پەیداکریو گەلەك جاران پێ هاتیە خەلات کرن.

دڤێ لێکۆلینێدا مەدڤێت هندەك بەرپەرێت ژیانا [یەشار کەمال]ی بێخینە بەرچاڤ وکانێ گەهشتی یەکێژ لۆکا هونەری دناڤ توڕێ تورکیدا، هەر چەندە گەلەك نڤێسەڤانا ل سەر نفیسییە بەلێ ئەز دبێژم نەب رەنگەکێ بەرفرەه، هەر چەندە ئەم ژی ب بەرفرەهی ل سەر نائاخڤین.

دناڤ توڕێ تورکیدا نەبەس [ی - کەمال]ی رۆمان دنڤێسین، گەلەکێت دیژی بەلێ کەس نەگەهشتە وێ

ئۆكا يەشار گەهشتىيێ وناڤێ وى ل جيهانێ هەمى بەلاڤ بوى. رۆمانێت وى ب رەنگەكىنەكە هەمى چارەسەرىيا ژان و خەمێت هەژارو جوتيارانە..

[ى ـ كەمال] ئێكە ژ رۆمان نڤيسێت ڤى دەمى ل توركيا، ئێكە ژشارەزاو تێگەهشتى يێت جيهانى، رۆمانێت وى بهايەكێ مەزن ديتىيە ل جيهانێ پشتى گۆهارتينە سەرگەلەك زمانا، ئەڤ گوهورينە ژى ديار دبيت كەرۆمانێت وى گەلەك بەبهاو نرخن لنك هەمى كەسا، تا ڤێ گاڤێ رۆمانێت وى گۆهارتينە سەر ڤان زمانا: ـ ئينگليزى، يونانى، فەرەنسى، ئەلمانى، ئەسكندنافيان، فارسى، عەرەبى و كوردى.

■ كورتە ژين: ـ

چوقورئوڤا ئەو گوندە يێ دەورو بەرێت وێ چيا.. رويبارێ «جيحون» دناڤدا دهێتە خارێ وهۆزێت كوچەرێت توركى تێدا رونيشتين.. ل ڤى گوندێ جوان و رەنگين.. پر دارو بار.. تێر ئاڤ.. رۆژەكێ ژ رۆژێت سالا (1923)ێ زارۆكەك هاتە سەر رويێ ڤێ جيهانا بەرفرەه وتژى قەرقەشە كە [ى ـ كەمال] بۆ.

ل ڤى گوندێ تازە [ى ـ كەمال]ى زاروكينى يا خو لێبوراندو هێدى هێدى ژيانا وى بەرف نەخۆشىيێ چو، بابێ وى ژبنەمالەكا دەرەبەگا بو.. لێ دايكاوى ژبنەمالەكا رێگرو جەردەڤانا بۆ.

ل سالا (1928)ێ ديت بابێوى يێ كوشتى د مزگەفتىێدا، دەمێ بويە سالا (1929)ێ دابچيتە خاندنگەهێ رابو رەڤىو نێزيكى سالەكێ بەرزەبو، هەمى كەس و كارێت وى ژێ بێهيڤى بون، پاشى زڤريڤە، سالا (1932)ێ رێكەك دابەر خوو چو گوندەكێ دوير دافێرى خاندن و نڤيسينێ ببيت، سالا (1933 وسالا 1934)ێ رەڤىڤە، لێ هەرو دچو گوهێ خو ددا وان سەرهاتى وچيرۆك و داستانێت خەلكێ گوندى دگۆتن.

[ى ـ كەمال] گەهشتە دوازدە سالێ كە (1935)ێ ئەو چيرۆك و سەرهاتىو داستان ژبەر كرن، دەمێ بويە چاردە سالى ئەو چيرۆك و سەرهاتىو داستان برەنگەكێ جوان دئێخستنە بەرێك ڤەو بوخەلكێ گوندى ڤەدگێران. ڤان چيرۆك و سەرهاتىو داستانا كارەكێ مەزن كر ل سەر [ى ـ كەمال]ى وهەمى نوىكرنە ڤە دناڤ نڤيسينێت خوداو هندەك تشتێت نوى ل سەر زێدە كرن و دئاخڤتن ل سەر مرۆڤێت (ئەنادول ـ أناضول)ى ژ تورو تبعەتێ وان و پەيوەندىيا وان ب ئاخ و سروشتى ڤە.. سالا (1940)ێ ڤيا خو رۆشنبير كەت و فێرى نڤيسينێت نڤيسەڤانێت جيهانى ب بيت رابو دەست هاڤێتە خاندنا هندەك پەرتۆكێت جيهانى يێت ڤان نڤيسەڤان و زانايا: دستوفسكى وجيمس جويس وسير فانتس و رامبو.. وگەلەك بەرهەمێت نڤيسەڤانێت مەزن يێت كەچيرۆك و رۆمانا دنڤيسن، ژبلى نڤيسينێت هۆزانڤان و نڤيسەرو هونەرمەندا.

[ى ـ كەمال] دبێژيت: «دژيێ بيست سالێدا من بەرهەمێت دستوفسكىو تولستوى وتشيكوفى خاندن. من ڤيا بچمە دناڤ رەهـ و ريشالێت ئەدەبێ جيهانىدا، دو نڤيسەڤانا جهەكێ تايبەتىيێ ل دەڤ من هەى ئەو ژى (فوكنرو ستندال)ن كە بهزرامن دهێنە هژمارتن چێترين تێگەهشتى يێت هەست پێكرنا داستانى.

دەمێ من دڤێت رۆمانەكێ بنڤيسم دڤێت ئەز بەرهەمێت دو نڤيسەڤانا بخوينم كەئەو ژى [نازم حكمەت]ە دا زمانێ خو نوى بكەم و [ستندال]ى ژى دا سنورێت سايكولوجى درۆمانا خودا بەرفرەهـ بكەم».

گەلەك كارێ درۆژنامەگەرێ داكرىو چاڤ پێكەفتن دگەل خەلكىدا دكرو گەلەك گۆتار لسەر سروشتىو ژيانا گۆندو باژێرا.. و هندەك گۆتارێت دى وگەلەك چيرۆكێت كورت و هۆزان ژى دنڤيسين. خاندەڤانا گەلەك حەز ژ نڤيسينێت وىدكر وجهێ دل خۆشىيا هەميا بۆ.

هونەرێ يەشارى هەمى ژ بيرو باوەرێت راميارى نە، ب تايبەتى ئەو بەرهەمێت سالا (1959 و 1974)ێ

نڤێسین و بلاڤه بوین. [ی ـ کەمال] دبێژیت: ـ

«بیرو باوەرێت رامیاری ژ هونەرێ من جودا نابن، هەر کەسێ رێکا بەختەوەری‌یا مللەتێ من بگریت، ب هونەرێ خو. ب ژیانا خوهەمی‌یێ دێ خو گۆری مللەتێ خوکەم».

ئەڤ نڤێسەرێ مەزن بەختەوەرێ مللەتێ خوو هەر دەم ب هزرا ژین و ژیارا وی بویە، باراپێتر ژ نڤێسینێت خو بو گەلێ خو تەرخان کری‌نە، ژ سالا (1971)ێ وەرە ژدەرڤەی تورکی دژیت ومشەختە ل وەلاتێت غەریبی‌یێ، لێ هەر چەندە ژڤێ دویراتیا مەزن و درێژ وەلاتێ خو ژبیر نەکری‌یە وهەر لبەر دلێ وی شرین تر لێ‌هاتی‌یە.

یەشار دبێژیت: من رۆمان یێت نڤێسین ب زمانەکێ ساناهی‌و بێ‌گرێ کە زمانێ هەرویە ئەوێ پێ دئاخڤن. هەروەسا رۆمانێت جیهانێ هەمی ب ڤی زمانی یێت نڤێساین مینا رۆمانا (داناس) و رۆمانا (ئەلیازو ئودیسا)و هەروەسا داستانا (مەم و زین).

ژ سالا (1975)ێ وەرە ناڤێ وی دهێتە ڤەگێران دگەل وان ناڤێت هەلبژارتین بۆ پاداشتا (نوبل) وەربگرێت.[1]

ئەڤ پاداشتە ژبەر زیرەکی‌و چەلەنگی یا وی بویە، [ی ـ کەمال] دبێژیت: ـ ڤێ پاداشتێ هندەك روی‌یێت گرنگێت هەین و هندەك روی‌یێت بێ‌بێر ژی هەنە، ئەز یەکەمین ئەدیبێ تورکی‌مە من دهەلبژێرن بو پاداشتێ، براستی ئەڤ هەلبژار تنە بو تورێ تورکی‌یە نە ژبو منە، ئەز یێ ب باوەرم کەتورێ‌مە یێ هەژی بو ب ڤەرکەفتنێ.

جارەکادی هاتە هەلبژارتن بو وەرگرتنا خەلاتەکێ ئەدەبی یێ جیهانی ل رۆژا (14ـ10ـ1982)ێ.

بەرهەمێت وی گەلەك لسەر چوقورئوڤاو دەورو بەرێت وێ‌نە، چنکی یێ ل وێرێ مەزن بوی هەتا گەهشتی‌یە ڤێ پلا هندە مەزن.

■ **ژ گۆتنێت نڤێسەڤانا: ـ**

[ی ـ کەمال] یێ‌هاتی‌یە نیاسین ل رەخ گشت نڤێسەڤانێت جیهانێ، هەر وەکی بومە دیاردبیت دەمێ (زەینەب ئورال) ل سەر یەشار کەمالی دئاخڤیت ودبێژیت:

ـ دهێتە هژمارتن ژ نڤێسەڤانێت هەڤ ـ چەرخێت کیشوەرا ئاسیاو ئەفریقیا کەهژمارەکا مەزن ژ رەخنەگرێت ئەدەبی‌یا وەلاتێت جیهانا سێ‌یێ یا ئاشکراو خویا کری. پاشی دبێژیت: یەشار کەمال یێ‌هاتی‌یە نیاسین کە رۆمانێت خو برێڤە دنڤێسیت.

بەلێ یەشار رۆمان نڤێسە! لێ رۆمانێت وی دچەوانن؟ ب چ رەنگن؟ ل ڤێرە ئەم دشێین ڤان پەیڤێت (جون بیرغر)ی دانینە بەر چاڤ کانێ رۆمانێت وی دچەوانێنەو ب چ رەنگن، دبێژیت: ـ

یەشار ئێکە ژ رۆمان نڤێسێت هەڤچەرخ یێت ب ناڤ و دەنگ، دەمێ مرۆڤ رۆمانێت وی دخوینیت دهێنتە هزرا مرۆڤی کە ژیان بخو دناڤ خودا رۆمانەکە.

لێ چەوان ژیان بخو دبیتە رۆمان؟ ئەو ژی:

ـ یەشار کەمال درستی‌و راستی وخەم و ژانا وەردگریت ژ چیرۆکێت فولکلۆری‌و رۆمانێت خو ژێ درست دکەت کە (ئیلیا کازان)ی گوتی‌یە.

چیرۆکێت فولکلۆری نەبەس بو یەشاری لێ بو هەر نڤێسەڤانەکی دبنە رێکەك دسەرا دچیت وهندەك لایا ژێ وەردگریت.

مەگۆت نڤێسینێت وی گەلەك ل سەر چوقورئوڤا نە هەروەکی هێژا (یوسف بنی ویس) ژی ڤێ دیار دکەت و دبێژیت: دەمێ چیرۆکەکێ یان رۆمانەکا یەشار کەمالی دخوینی دێ هەست پێ‌کەی کە تو وێ د ژی ب وی رەنگێ وی نیگارکری، و د ئاخڤیت لسەر خولکێت رویدانا (دقائق الاحداث) ل چوقورئوڤاو سیلیسیا کە ژیانا خو ل زاروکینی‌یێ هەمی ل وێرێ بوراندی‌یە. .

[ی ـ کەمال] کەتبو دەردە سەریەکێ‌و گەلەك ژیانا وی نەخۆش بۆ ئەو ژی ژ چاڤێ چەپێ یێ سەقەتەو بەس ب چاڤەکی‌یە، ئەڤ چەندە ژی بومە دیار بو دەمێ رۆژا (1973/9/4)ێ چیرۆك نڤێسێ هێژا حسێن عارف و

هۆزانڤـانێ تورکمـان ـ عبـداللطیف بنـدر ئۆغلۆ[2] ـ پێکڤـه چوینه باژێرێ [ئەلمائەتا] پایتەختێ کازاخستان، بو کونگرا پێنجێ یانڤیسەڤانێت ئاسیاو ئەفریقیا.

(یەشار کەمال) ژی چو بو وێ کونگرێ، دەمێ حسێن عارفی پێ‌نیـاسین دگـەلـدا کری، ئەڤ چەنـده دیـار بو ودبێژیت: بەکورتی یەشار کەمال، پیاوێکی زەلامی چوار شانەی تێکسمراوی رەشتاڵەیەو چاوێکی سەقەتە.

لێ نڤیسەڤانێ تورکی سەمیم قوچەگوێزی [ی ـ کەمال] ژ بیر نەکرییەو بو بەرهەمێت وی دبێژیت: تەمبویرا وی یا ددەستادا، ئەو بخو دزانیت چ ستران دبێژیت و ب چ نەزم دێ هەلکێشیت.

بەلێ هوسان کەس ژگوڤەندا [ی ـ کەمال]ی تێر نەبویەو تێر نابیت، چنکو ناڤ و دەنگێ وی یێ گەهشتییە هەمی کونجێت جیهـانێ. (عبـدالوهاب الداقوقی) مینا گەلەکێت دی چەنـد پەیڤـا لسـەر دنڤیسیت و دبێژیت: یەشار کەمال یێ پەیدا بوی ژ خوینا مللەتێت ئەنادولی، دلێ وی تژی‌یە ژ چیـرۆك و سەرهـاتی یێت فولکلۆری یێت هاتینـه گوتن ژقوناغ بو قوناغێ، ئەو بخو وەکی هومیروسی‌یە دنڤیسینێت خودا، کەلەپوری زار دەڤ ژسەرێ چیاێت ئارارات و لسەر لێڤێت دەریا (ئیجه) دگەهینتە مە.

د هنـدەك بەرپـەرێت دیدا دبێـژیت: دەمێ رۆمانا وی (محەمەدێ لاواز) کە یەکەمین بەرهەمێ وی‌یە ـ گوهوری‌یە فەرەنسی، رەخنـەڤـانـا لسەر د گوت: هومیروسێ چەرخێ بیستێ‌یـە، و (ئـالان بوسکیـه) ژی دبێـژیت: مەزنترین رۆمان نڤیسە ڤێ گاڤێ ئەم دنیاسین.

رۆژهەلاتێ فەرەنسی (توما بوا) ژی ئەڤینداریێ یەشاری بویـەو وی ژی چەنـد پەیڤـەك نڤیسینەو دبێژیت: کوردەك بتنێ شیایە هەست ب حەز ژێ‌کرنا سترانا کوردی یا بێ دویماهی بکەت ئەو ژی یەشار کەمالە.

هندی ئەم بەرپەرا ڤەدەین دێ پەیڤێت جوان بومە خویا بن کە هەمی باسێ وی‌نەو کەس ژێ تێر نەبویە، یەشار گەهشتی‌یـە رێـزا تولستـوی‌و هەمـەنگوای‌و دستوفسکی‌و. ئەگەر ژوان سەرکەفتی‌تر نەبیت.

■ **یەشار کەمال کوردە:**

دەمێ ئەم رۆمانێت یەشاری دخوینین ب تایبەت هەمی باسێ کوردانە، چنکو یەشار ژ بنەماڵەکا کورد بویەو ل ناڤ کوردا مەزن بویەو رۆژێت خو بورا ندی‌نە. ئەڤە ژی بومە خویـاو ئاشکـرا دبیت دەمێ مە پەیڤێت (تـومـا بوا) دانـاینە بەرچـاڤ و ژوان کەسێت لسـەر یەشـاری نڤیسین، لێ تشتەکێ مرۆڤ بێژیت پسیارێت ددویڤرا هەین، چێ دبیت هنـدەك بێـژن نەکـوردە. ئەگـەر کورد بیت کانێ بەلگێت هەوە؟ هەلـبـەت ل دویـڤ زانینـا خو ب کورتی ئەم ژی ب ڤی رەنگی دێ بەرسڤا ڤێ‌پسیارێ دەین و بێژین: ـ

1) ـ یەکەمین بەلگە ئەوە شوکور مستەفا دبێژیت:

د رۆمانا (محەمەدێ لاواز)دا دگەلەك جهادا محەمەدێ لاواز ب زیـرەکی‌و مەردایـەتی‌یێ مینـا کوردایـە، دگـەلـەك جهێت دیدا کورد دچنـە دنـاڤ رۆمـانـا وی‌داو دەورێ مێرخاسی‌و مەردایەتی‌یێ وەر دگرن.

2) ـ دررۆمـانـا [تـەنـەکـە]دا گەلـەك جاران ژ زار دەڤێ (محـەمـەد عەلی کورد)ب تورکی‌یـەکـا گوندینی‌و هنـدەك جاران پەیڤا کوردی:

«ئاخ باڤۆ/ بپ 107، 124»ێ نڤیسی‌یە، خویا دبیت کوردی‌یەکا باش دزانیت لەوان ب کوردی نڤیسی‌یە.

3) ـ [ی ـ کەمال] دبێژیت: براستی مە گەلەك تشتێت ژ دەستێ خوکرین، لێ بهایێ مرۆڤایەتی یێ مە ژرکیسێ خو نەکـری‌یـەول پاشـەرۆژێ دێ شێین زڤـرینـە رەهـ و رەگـەزێن خو، یا باشتـر ئەوە بێـژین ب راستی دێ شێین جیهـانـەکـا نوی درست بکـەین. رۆژ ئاڤـایا گەلەك بهایێ مرۆڤایەتی‌یێ ژدەست خو کری‌یەو ئەم دبینین قەست دکەنە وەلاتێت مە.

4) ـ بەلگێ ژهەمیا بـ هێزتر ئەڤە: بەری نهومە گوت حسێن عارف و هۆزانڤانێ تورکمان عبداللطیف بندر ئۆغلۆ دەمێ چوینە کازاخستان یەشار ل وێرێ بو، حسێن عارف دبێـژیت: (عبـداللطیف)ی گوتـە من ئەڤە [ی ـ کەمال]ی

مە دڤێت نیاسینێ لگەڵ بکەین، دەمێ نیاسین لگەل کری دبێــژیت مەگۆتێ: مەیـا گولێ بوی تو ژمللەتێ کوردی، ئەرێ راستە؟. یەشاری گۆتێ: بەلێ راستە، گوهێ هەوە ژی بێ ل من کە ئەزێ ب کوردی دگەل هەوە دئاخڤم.

(ح ـ عارف) دبێــژیت: [دەمێ دەڤێ خو ڤەکــری دا باخـڤـیت، ب کوردیـیـەکـا پەتی یابێ گرێ، ب زارێ کرمانجی‌یا ژووری دەست ب ئاخڤتنێ کر.

هەلبــەت بومـە خویـا بو [ی ـ کەمـال] کوردەو خەلکێ کوردستــانـــا تورکی‌یـــە، ئەم دشێین گەلـەك بەلگێت دێ بینین، لێ ئەز دبێم ئەڤە بەسن بو ڤێ چەندێ، هەر چەندە نڤێـسـینێت خو ب زمـــانێ کوردی نەنڤیســاینــە ئەو ژی دزڤریتە سەر وان بارو کاودانێت کوردێت تورکی تێدا دژین کە هەتا ڤێ گاڤێ نەشێن نە جل و بەرگێت کوردی بکەنە بەرخو نەژی ب کوردی باخڤن.

■ قەفتەك ژبەرهەما: ـ

براستی ئەم ناڤێ هەمی بەرهەمێت وی نزانین لێ دێ هندەك بەرهەما دانینە بەرچاڤ، وئەم نزانین کیش ل دویڤ کیشکێ دەرکەتی‌یە ژبلی هەر سێ یێت یەکێ.

1 ـ سالا (1955)ێ یەکـەمین رۆمـان ب ناڤێ [انجـە میهمــەت] ئانکــو (محــەمـەدێ لاواز) بلاڤ کر و کەڤتــە بەردەستێ هەمێ خانــدەڤـانـا، ژ هەمی بەر هەمێت [ی ـ کەمالی] ب نرخ ترەو گوهوڕی‌یە گەلەك زمانێت ئەورووپی‌و ئاسیاو ئەفریقیا، چاردە جاران ل تورکیا چاپ کری‌یە، ئەڤ رۆمانە وێنەکە ب زیرەکی‌و پەهلەوانی‌یا [محەمەدێ لاواز] نڤێسای کە مرۆڤەکێ کورد بۆ.

2 ـ تەنــەکــە: ل ئسـتــانــبـولـێ سالا (1959)ێ چاپ کری‌یــە، ئەڤــە بەرهـــەمـــێ دووێ یە، هەروەســا گوهـوڕی‌یـە گەلـەك زمـانا، ئەڤ رۆمانە ژ رویدانەکا راستا دەرئێخستی، چەنــد سالــەکـا ل سەر شانۆ یێت تورکی‌یـا کری‌و سالا (1975)ێ ل باژێــرێ (گــوێتــە بۆرگ)ێ ل (ئیسوێچ) چەند هەیڤا ل سەر شانۆیێت وان کری‌یە. سالا (1981)ێ کری‌یە کوردی.

3 ـ کاریتـە یا ئەو دیـوی چیـا: ئەڤـە رۆمانا سێ‌یێ‌یە، باسێ وان کەسێت دەشتــا (جکــروڤـا) یەکـە هەمی سالا کاردکــەن بۆ بەرهــەمــەکێ باش ژ پەمبی ب دەست خو بێخن، ئەڤە ب ڤان نێزیکا دێ کەڤتە بازاری.

4 ـ ئەفسانەی چیای ئاگری: سالا (1976)ێ کری‌یە کوردی.

5 ـ ئەفسانەی کوێر ئۆغلی: سالا (1980)ێ کری‌یە کوردی.

6 ـ باڵدەکی توز: رەخنە یە.

7 ـ ئۆرتە دیرەك.

8 ـ ئوێلمەز ئۆت.

9 ـ بربو لوط قاینیور.

10 ـ ئەوێت تاری‌یێ رێکێ ڤەدکەن.[3]

رۆمـانـا (ئـەفسانەی چیای ئاگری‌و کوێر ئۆغلی‌و تەنەکەو کاریتە یا ئەو دیوی چیا) هێژا (شوکور مستەفا)ی گوهوڕینە کوردی‌و چاپکرینە، هەڵبەت دڤێت بەرێ هەمی کەسا ئەم سوپـاسیـا وی‌و داخـازا ژی‌یەکێ درێژ بوبکەین دا هەردەم خزمەتا پەیڤا کوردی بکەت، ل دویماهی‌یێ ئەز دبێژم ئەڤ پەرتۆکێت مە رێز کرین بەسن هەر چەندە گەلەك نڤیسینە و دبـەلاڤن لێ مخـابن هەمی نەلبـەر دەستێ مەنـەو ئەم تامـا هەمیـــا نزانین، یامــە ژێ چاڤ لێکــرنــە کانێ کەنگی سەیـدایـەکێ مینـا (شـوکـور)ی بومە یەکێ بگوهوڕیتە سەر زمانێ زکماکی‌یا [ی ـ کەمال]ی ومە هەمیا دا بخوینین و هیڤی‌و خوزیێت وی بزانین.

لێ دویمـــاهی‌یێ من دڤێت بێــژم رۆمـانـا وی‌یـا نوی

[تـاوانـەك ل بازارێ ئاسنگـەران] كە ـ مۆنفیـر ئەنداك ـ ی كریـیە فەرەنسیو ل دەزگەها «غالیمار» دەركەڤتی، ب ڤێ رۆمانێ [ی ـ كەمال]ی ناڤ و دەنگێ خو ب درستی یێ بەلاڤكری.

■ ئاڤری: ـ

دێ ژێـدەرێت خو هەمیـا ب رێـزكەم، چنكو ئەز دبێژم نەپێدڤییە هەردەم بێژم بەرێ خوبدە بێڤان ژێدەری.

فەرۆز: ـ

1 ـ ئاواز زەنگەنە دبێژیت: سالا (1973)ێ وەرگرتی یە، لێ چو نرخ ژبـو نینـە چنكـو بێ ژێـدەرە، لێ یا (عبـدالـوهـاب الـداقـوقی) مەوەرگـرت چنكو ژێدەرێ وی گۆڤارەكا توركییە ب ناڤێ (یانقی) هژمارا (47)ێ ل 12 ـ 18 مارتا (1979)ێ.

2 ـ ئۆغلۆ: هۆزانڤـانـەكێ توركمـانـە سالا (1937)ێ ل قەزا طوزخـورمـاتـو ل پارێـزگـەهـا صلاح الدین هاتییە سەردنیـایێ، ل ئامـوژگـایا فێركرنا پیشە سازی ل كەركوكێ دخاندو پاش (فصل) كر ژ بەر ئەگەرێت رامیاری ل سالا (1956)ێ وكاركر ل پیشێت سەر بخو.

دەمێ مافێ روشەنبیرییا توركمانی دایێ ل 24 كانوینا دووێ (1970)ێ بۆ رێڤـەبـەرێ هەرێمـا ژووریو پاش بورێڤەبەرێ روشەنبیرییا توركمانی ل وەزارەتا روشەنبیریو بەلاڤكرنێ.

هەڵبـژارت بۆ سكـرتێـرێ روشـەنبیـرییـا ئێكـەتییـا نڤێسـەڤـانێت توركمـانی، ژ (18) پەرتـۆكا پێتر بەلاڤكرینە ب زمـانـێ توركمـانـیو عەرەبی ژهـۆزان و لێكـولێن و گوهورین، هۆزانێت وی گوهورینە گەلەك زمانا.

3 ـ (6، 7، 8، 9، 10)ژ پاشەكییا رۆمانا (تەنەكە) هاتینە وەرگرتن.

■ ژێدەر: ـ


1 ـ مع الاكراد: توما بوا ـ ترجمة آواز زەنگنە/ 1975.

2 ـ مجلة ـ الثقافة ـ العراقية: العدد (2) شباط 1980.

3 ـ ئەفسـانـەی چیـای ئاگری: یەشار كەمال ـ گوهورینا: شوكور مستەفا/ بەغدا ـ 1976.

4 ـ تەنـەكـە: یەشـار كەمـال: گوهورینا: شوكور مستەفا/ بەغدا ـ 1981.

5 ـ گۆڤاری بەیان: هژمار 64 تەمموزا 1980.

6 ـ گۆڤاری بەیان: هژمار 76 كانونیا دووێ 1982.

7 ـ گۆڤاری بەیان: هژمار 85 نیسانا 1984.

8 ـ رۆژناما [العراق]: هژمار 2156 ـ 1983/3/5.

9 ـ رۆژناما [هاوكاری]: هژمار 675 ـ 1983/2/17.

10 ـ نووســەری نوێ: گۆڤـاری یەكـێتیی نووســەرانی هەولێرە ـ هژمار (4) ـ 1979.

11 ـ نووسەری كورد: هژمار (11) خولی دووەم ـ شوباتا 1983.

12 ـ یەشار كەمال [مجموعة قصص]: ترجمة عبدالوهاب الداقوقی ـ 1980.

# خەون

**• سمکۆ ئەحمەد ڕەشید •**

ئەمشەویش وەکو هەموو شەوانی تر، مەلی خەو لە هێلانەی چاوەکانت تۆرابوو. بە ئاسۆی ئاسمانی بێداریتا لە شەقەی باڵی ئەدا. سەری ئەکرد بە هەموو سوچێکی ماڵە هەژارەکانی شاردا. تینت دایە خۆت، سەرت بەرزکردەوە بەم لاو بەو لای خۆت دا ڕووانی. منداڵەکان لە گەڵ شیرین خەودا لە دەستە ملانێکی خامۆش دابوون. لە پەنجەرەکەوە بەرەو ئاسمان هەڵتڕوانی، ئاسمان ڕەشماڵێکی ڕاخراوبوو بەسەر شاردا. ئەستێرەکان خۆیان حەشار دابوو. بروسك و هەورە تریشقە ئاوتاودری بە تاریکییەکە ئەدا. منداڵەکان جووڵەیەکیان بۆ ئەکردو مات ئەبونەوە. بەڵام لە ساتە وەختێك بەولاوە سەرت بۆراگیر نەکرا، سەرت کردەوە سەر سەرینەکەت، خۆت کردەوە بە ژێر لێفە شرەکەت دا، جووڵەت لە خۆت بری.

چاوەڕوان بوویت نەختێ خەو بێتە میوانی چاوەکانت. چاوەڕوانیت درێژەی نەکێشا مەلی خەو لە هێلانەی چاوەکانتا ئارامی گرتەوە. نوقمی دەریای خەیاڵ و خەون بینین بوویت:

ڕێبواری هەردێکی سەخت و دژوار بوویت.. وێڵ بوویت.. سەرگەردان بوویت.. چاوەکانت وەکو دووهەڵمات بەم لاو بەولادا ئەگێرا بۆ شوێن پێی ڕێبوارێك تاکو شوێن پێی هەڵگریت. وەك لەبەر خوا بلاڵێیتەوە بەرەو ئاسمان هەڵتڕاوانی ئاسمان هەرەشەی بارانێکی سامناکی لێ ئەکردیت. سەرت دانەواندەوە. بە بەردەمی خۆت دا ڕووانی. زنجیرە شاخێك ئاسۆی ڕوانینەکەتی بەچەند هەنگاوێ قۆستەوە. ئاسمانی ڕەش داگەراو لەودیو زنجیرە شاخەکانەوە ئەنیشتە سەر ئەوێ. وەرچەرخایتەوە بۆلای ڕاست و چەپ و دواوە هەمان دیمەنت بەدی کرد. سامێکی تەلیسماوی لەناختا چەکەرەی کرد. بەهەموو دەمارەکانی لە شتدا گوزەری کرد. تێکەڵاوی خوێنت بوو. بەرەو ئاسمان هەڵتڕوانی دڵۆپە ئاوێك پێڵوەکانی پێ نایتەوە سەر یەك. دڵۆپێکی ترو... دوان و... سیان... بارانێکی بەگوڕ دای کرد. گیان کێش لە نێوان پەڵەهەورە تەڵخەکانەوە سەرە تاتکێی لەگەڵا ئەکردی بەڵام تۆ خۆت نەئەدا بەدەستەوە. سەرت دانەواندەوە. نیگات بری بە نووکی پێڵاوە شرەکانت، پەنجەکانت وەکو بێچوە چۆلەکە سەریان دەرهێنابوو. هەناسەیەکی قوڵی پڕ لەناسۆریت هەڵکێشا. کەوتیتە دونیای خەیاڵ و بیرکردنەوە. بیرت لەخۆت ئەکردە. بیرت لە ژیان ئەکردەوە. بیرت لەو شتە ئەکردەوە کە بەدوایا وێڵ بوویت. ئەم بیرکردنەوانە ژاوەژاوێکی زۆریان خستە مێشکتەوە. قاچەکانت کەوتنە لەرزین. ددانەکانت کەوتنە قوچە قوچ کردن. چاوەکانت بری یە ئەوبەشەی ئاسمان کە ئەتتوانی ڕاستە وخۆ بەدی بکەین، پەڵە هەورەکان بە خێرایی کۆچیان ئەکردو جێگای یەکتریان ئەگرتەوە. بەرەو ناوەڕاستی ئاسمان هێرشیان دەبرد. بەرەو ناوەڕاستی ئاسمان هەڵتڕوانی. دڵۆپە ئاوێك وەکو چاوەڕوانی ئەم هەلە بووبێ خۆی کوتایە نێوچاوت. سەرت دانەواندەوە، هەستت ئەکرد هەموو دونیات بە کۆڵەوە گرتووە.. مەینەتی هێرشت بۆدێنێ.. ئەیەوێ دڵە پڕ لە ئاواتەکەت داگیر بکا. خەریك بوو وورە بەردەیت، لە بەر خۆتەوە وەك ورێنە بکەیت:

نەخێر... من نابێ وورە بەردەم... هەرگیز نابێ..

بەم چەند وشانە نەختێك دەروونی گرتووی خۆتت باوەشێن کرد. تینت دایە خۆت هەنگاوە شل و شۆقەکانت خێراتر ئەکان پێ دەدا. ئەکەوتیت و

هەڵ ئەستایەوە. گوێت هەڵ ئەخست بۆ دەنگێك، بەلاّم لە گرمەگرمی هەورە تریشقە و خورەی باران بەولاوە هیچی ترت نەئەبیست. تەنانەت باڵندەیەکیش بەم ناوەدا گووزەری نەئەکرد. سەرنجت گرتە زنجیرە شاخەکەی بەردەمت، نیگای چاوەکانت بەسەر ئەشکەوتێك داگیرسایەوە. دڵنیابوویت کە خوێشی یەکی گەورە لە ئەشکەوتەکەدا چاوەڕێت ئەکات و باوەشی بۆگرتوویەتەوە. لە باوەشی دا ئارام ئەگری، جەستە داهێزراوەکەت گەرم ئەکاتەوە، حەزئەکەیت لە باوەشی یا نەیەیتە دەرەوە. لە دڵەوە بڕیاریت دا بیگەیتێ. تەکانت بە جەستە شەکەتەکەت دا هەنگاوەکانت گورج کرد، ئا مبازی بەرزایی یەکە بوویت، چەند هەنگاوێ سەرکەو تیت، تووشی هەناسە برکێ بوویت. ئاورێکت لە دۆڵەکە دایەوە، وەکو گورگێکی برسی دەمی لێ داپچڕیبووی بۆقۆزتنەوەت. زیاتر جەستەت بۆبەردەمت نووشتاندەوە تەکانت دا. چەند هەنگاوێکی تر سەرکەوتیت، لە پڕ هەلخلیسکایتەو بەپشتی سەراکەوتی. دووبارە دۆڵەکە لە باوەشی گرتیتەوە. هەستت ئەکرد دۆڵەگەلێ هەموو لایەکەوە دێتەوەیەك و گۆڕەشارت ئەدا.

سامێکی گرانت لێ نیشت، هەستت ئەکرد قاچەکانت چەند بەژنێ بەناخی زەوی داچوونەتە خوارێ. بەرەو ئاسمان هەڵتروانی پەڵە هەورەکان تا ئەهات زیاتر ڕەش داگەڕان و ئاسۆیان ئەکردە تاریکستان. سەرنجت گواستەوە بۆ ئەشکەوتەکە.

کەوتیتەوە زۆرانبازی لەگەڵ بە رزایی و شاخەکاندا، بەلاّم ئەمجارە تۆبەسەر نەلیسمەکەدا زاڵ بوویت و لەنێو ئەشکەوتەکەدا گیر سایتەوە. وەك لە دەمی شێر ڕزگارت بوویێ، هەناسەیکی شادمانینئ هەلکێشا. بێ ئەوەی سڵ لە ئەشکەوتەکە بکەیتەوە پاڵت لێ دایەوە. دەستە لە ڕزۆکەکانت بۆگیرفانت درێژ کرد، جگەرەیەکت دەرهێنا و داتگیرساند. وەك لە بیابانێکی ووشکەرۆدا ئاوت چنگ کەوتبێ بەپەرۆشەوە مژت لێی ئەدا، چاوت برییە شوێن پێ کانی خۆت ئەتوت کاروانێك بەم ناوەدا گوزەریان کردوە. پێلاوە شرەکانت چەند جارێك لە یەکتر گیر کردو داتکە : ناندن.

کەوتیتە ناو گێژاوی خەیاڵ و لێکدانەوە:

بێ گومان ئەوەی من بەدوایا وێڵم پێویستی بەکارەسات و بەسەرهات و شەو بەکۆڵەوە گرتن هەیە..

مروڤ پێویستە لە پێناوی «ئازادی»دا گیان ببەخشێ... کۆڵ نەدەربێ... بەرەو ڕووی گەردوون ببێتەوە... ئامبازی هەموو کارەساتێك بێ... خۆئەگەر چەند جارێکیش ژێرکەوتووبی... ئەنجام سەرکەوتن بە دەست دێنێ...! سەرنجت برییەوە ئاسمان، پەڵەهەورەکان کۆچیان ئەکردوئەم ناوەیان بەجێ ئەهێشت. ناوەناوێك چەند دڵۆپە بارانێك شەپۆلیان ئەخستە سەر گۆماوەکان لەوە ئەچوون دڵۆپی دوایی بن. ڕۆژ وەکو کچۆڵەیەکی شەرمن لەنێوان پەڵە هەورەکان سەرەتاتکێی لە گەلا ئەکردی. دەرئەکەوت و وون ئەبووەوە. تەزوێکی شادمانی سەرتاپای لەشی داگرتیت. هەستت ئەکرد دوای ئەم هەموو مەینەتی یە خەریکە سەر فراز ئەبێ. زەردە خەنەیەك چرچ ولۆچی نێوچەوانێ ڕەواندەوە. وەك دەنگێکت بیستبێ گوورج هەڵسایتە سەرپێ و لە ئەشکەوتەکە هاتیتە دەرەوە. وەکو باکورو باشوری خۆت دەست نیشان بکەیت بای باڵی خۆتت دا. بەرەو سەرووی ئەشکەوتەکە هەڵتروانی، چەند هەنگاوێکت مابوو بۆسەر زنجیرە شاخەکان. بەروو یەکی گەشەوە چەند هەنگاوێکی گورج بەرەو سەرەوەیان بەکێش کردی. خۆت لەسەر بەرزترین لووتکەی شاخەکان بینی. وەکو ماڵ ئاوایی لە دۆڵە کەبکەیت، بۆدواجار سەرنجێکت لێ گرت. وەچەرخایتەوە.. بەرەو خوار شۆڕ بوویتەوە..

+ڕوڵە... قارەمان... قارەمان... دەهەڵسەکورم..!

# بە خامۆشی بەجێی هێشتم



ئـەمرۆ پێنـج هەفتـەیـە دەستی مەرگی باوکم لە دەرگـای سەرم ئەدا. . پێنج هەفتەیە دوا هەواری باوکم بەسەر یاڵی دڵما هەڵ دراوە. . بە تەنیایی لەگەڵ دایکێکی ڕەش پۆش و بێچـارەدا دانیشتـوم. . دڵم خەڵـوزی ڕەشـەو بە پشکـۆی ئارامگـــای باوکم داخ کراوە. . من و دایکم جگـــەرە ئاگـر ئەدەین دوکـەڵی هەنـاسـە ساردیمـان لە ناو تەمی ئەم ژیانا ئەتـــوێتـــەوە ئەو بەس بۆ باوکـم و منیش بۆ مەرگی باوکم و ڕەشپـــۆشی دایکم. . دایکم بەس ڕەش پۆشـــە. بەڵام من ڕەش پۆشیشم و بێ هۆشیشم.

چاوەکـــانم تەم گرتـــونی لە بەر دەمی تەمـــەکـەدا وێنـە ڕەنگینەکەی باوکم هەڵ واسراوە. . هەر من و دایکم لەناو تەمـــەکـــەدا ئەژین. من لە دایکیشم و لە وێنـەی بەردەمی تەمـەکـەیش ئەڕوانم. . . لەگـەڵ هەر مژی جگـەرەیـەکدا دڵـۆپـە بارانی یادو بیـرەوەریـیـەك لە ئاسمانی هەوراویمەوە دێتە خوارێ.

چاوەکـــانـم تەڕ ئەکـــا تۆزی خەمـی دەرونـم ئەنـیشێ و پشکۆیەك لە خەڵوزی دڵم ئەکوژێتەوە. .

پێنـــج هەفتـــە لەمـەو بەر باوکم لەگـەڵمـانـا دانیشتبـو، هەروەکو جاران قسەی خۆشی بۆ ئەکردین.

ـ ئەترسم بەجێت بێڵم و بوکەکەم بە چاو نەبینمەوە. .

بوکـــەکـــەی ئافـــرەتێکی باش بو تاکـــو باوکم نەخـۆش نەکەوتبو. خزمەتی ئەکرد. . بەڵام لەگەڵ دایکما نەئەگونجا . . هـــەمیشـە هەر خەریکی ئاژاوەو شەڕ بون. لەسـەرشتی ساکـــارو ئاســـایی گەورەتـــرین شەڕی تیـا دروست ئەبـو بەتایبەتی لە کاتی نان خواردن تاکو وای لێ ئەهات بوکە بە تۆراوی بەرەو ماڵی باوانی ببێتەوە. .

هەڵ مژینی جگـــەرەیـــەك خەمـــەکـەم ئەڕەوێنێتـەوە. . تۆزێك ژانی زامی دڵم ئەشکێ . . چاوەکانم دەست ئەکا بە دڵـــۆپـە باران و کوڵمـەکـانم ئەشـواتـەوە. . ڕوم هەر لە وێنەکەیە. . دەنگەکەی باوکیشم هەر لەگوێما ئەزرنگێتەوە. .



«ئەترسم بەجێت بێڵم و بوکەکەم بە چاو نەبینمەوە.»

بەجێی هێشتم.. بە خامۆشی بەجێی هێشتم بوکەکەیشی هەر نەبینیەوە.. بەڵام لەناو دڵما تابلۆو یادگارەکانی لە بیرەوەری ژیانی ڕۆژانەما ئەنوسمەوە...

ئەو کاتەی من مناڵ بوم. باوکم بزەی خۆر لە لێوی ئەباری.. بەهاری ژیانی سەوز بو. پتەوو بەخۆ بو هاورێی ڕۆژانەی باوکم و موچەی ژیانی ئابوریمان لەسەر ئەو پەستەکە پڕ پوشەبو کە ڕۆژانە ئەیکردە کۆڵی..

باوکم هاورێکەی خۆی زۆر خۆش ئەویست ـ چونکە نانی لەسەر پەیدا ئەکرد هێشتا ئەرەقی ناوچەوان و گیانی وشك نەببۆوە باڵی پەستەکەکەی کە کردبوی بە لاشانیدا،

● «شەماڵ باراوی» ●

دای ئەنا.. دەستەکەی دی بوخچەیەك میوەی تیا بو ئەیدایە دەست دایکم.. منی ئەگرتە باوەش و ماچی ئەکردم.. منیش ماچم ئەکرد.. بە دڵخۆشیەوە دائەنیشتین، ئەو شۆربایەی کە دایکم لێی نا بو ئەمانخوارد، چایشمان ئەخواردەوە.. پاشان لەگەڵ باوکمدا دەستمان ئەکرد بە گەمەو یاری.. لەگەڵ ئەوەی ماندوو بو.. یاری لەگەڵ ئەکردم.. من بیانوی ئەوەم لێ ئەگرت کە وەك شەوان نوێنەکان لەسەر یەك هەڵ بچنێ و وەکو ئەسپ سواری بم.. ئاخر من زۆر حەزم لە سواری ئەسپ بو یان جامانەکەی خۆی بەسەرما پێچ ئەداو لەو دیو پەنجەرەکەوە چاوشارکێی لەگەڵ ئەکردم..

ئەم یادە ئەڕەوێتەوەو یادێکی دی جێی ئەگرێتەوە.. ئەوە باوکمە.. باوکی داماوم.. پەکی کەوتووە.. بەگۆچانێکەوە لە نوێژ ئەگەڕێتەوە.. تازەیش لە نەخۆشخانە هاتۆتە دەرێ.. من و خێزانەکەم.. دایکم و مناڵە ساواکەم چاوەڕوانی ئەوین، تاکو وەکو خێزانێکی بەختەوەر لەسەر یەك سفرە شێو بکەین.. مناڵە ساواکەم تازە فێرەدانیشتن بوە.. بۆ باوکم ئەشنێتەوە.. نیگای بۆ ئەکا.. باوکم ماچی ئەکا.. خێزانەکەم پێی ناخۆشە.. چونکە باوکم نەخۆشە.. باوکم ئەڵێ «وەڵلاهی هەر ماچت ئەکەم. با هەر پێیان ناخۆش بێ.» ئەم یادەیش ئەڕەوێتەوەو یادێکی دی دێتەوە جێی.. ئەوە باوکمە.. باوکی داماوم.. باوکی تەنیام بۆ جارەدووەم لە نەخۆشخانە کەوتووە... بەیانی زووە. کاسب کاران.. ئەچن بۆ کار

. . کرێکـاران لە بێ ئیشیـدا لە مەیـانـەکەی خوار مزگەوتی گەورە ڕاوەستاون و ئەسورێنەوە چاوەڕوانی کەسێکن لەگەڵ خۆیا بۆکار بیبان باتەوە. . باوکی منیش چاوەڕوانی هاتنی منە . . منیش لە جگەرخانەیەك جگەری بۆ ئەکرم و لەگەڵ تەرمـۆزە چاکـەدا بۆی ئەبـەم. . ئەچـمـە لایـەوە، دائـەنیشم. . ماچی ئەکـەم . . سـەرم ماچ ئەکـا . . لـە تەرمـۆزەکـە چای بۆ تێ ئـەکەم. . پاروەوە جگەری بۆ ئەکەم . . چـاوەکـانـیـ هەر لێـم ئەڕوانـێ پاروەوە جگـەرەکـەم لێ وەرئـەگـرێ. . چاوەکـانی هەر ناتروکێنێ . . وەکو ئەوەی ترسی ماڵئـاوایی هەمیشـەیی لێ نیشتبێ . . بـەلێـوی وشك هەڵ هاتووەوە. دڵی قوڵپ ئەداو بەدەم گریانەوە بۆم ئەدوێ

- ڕۆڵــە گیــان مانــدووم. پەکـم کەوت وخێـرم نەدی . . ئینشاءالله ئەمرم و ئەحەسێمەوە. تۆیش ئاگات لە خۆت بێ. . »

- تکایە باوکە گیان قسەی وا مەکە . . ئینشاء الله نامری. .

- ئەی بۆچی باشم کوڕی شیــرینم؟! بۆ مەینـەتی دنیـا بمێنم! یان ببم بە بار بەسەرتانەوە. ؟! . .

- نا باوکـە گیــان . . نــا. . تۆ باوکی منیت. . من تاکـو ئیستــایش ڕۆژگــار مۆڵــەتی نەداوم پاداشتی باوکـایـەتیت بدەمەوە. . . «دڵۆپی چاوەکانی منیش دێنە سوێ. . سوێی دڵم بەزەییم ئەجوڵێنێ و تێکەڵی بەو فرمێسکانە ئەبن کە لە پاروەوە نانـەکـەی دەمی باوکمـدا ئەتـوێنـەوە. . بۆیە منیش ئەگــریم . . ئـەگـریم ئەم یادەیش ئەڕەوێتـەوەو یادێکی دی جێگای ئەگرێ. .

هەردوکمــانین. . من و باوکم. . لەپــاش دوو هەفتــە کەوتن، بە کۆڵێ دەرزیو حەبی گەچاویو دەرمانەوە بەرەو ماڵ ئەبینــەوە. . خۆم جێی بۆ ڕائـەخـەم . . خێـزانـەکـەم نارەزایە. ڕوخساری ترشاوەو بۆنی ناخۆش چەشنی هێلکەی پیس لە دەمی دێ. . لە ژێر لێوەوە. . بۆڵە بۆڵ ئەکا. .

- بۆچی من خزمــەتکــاری چەنــد کەسم؟! من بەس خزمەتی خۆمان و مناڵەکەمم پێ ئەکرێ. .

- کچم پەلە مەکە هەمومان پەکمان ئەکەوێ . . لە مناڵی بۆ پیریو لەپیری بۆ مردن . . پەلەت نەبێ ڕزگارت ئەبێ. .

- لێ ی‌گەڕێ باوکە. ئافرەتی ئەمڕۆ هەروا بوگەنن. . . تۆ بۆ وا ئەکەی؟! ها!!

«لـە داخـانـا. لەپـاش لێدانێکی زۆر بەرەو ماڵی باوانی ڕەوانەی ئەکەمەوە. . .

ئەم یادەیش ئەڕوا یادێــکــی‌دی شەپــۆل ئەدا. . هەر سێکمانین. . من و باوکم و دایکم . . وەکو جاران کە ژنم نەهێنا بو . . بە تەنیایی دانیشتوین. .

- نازانـم چ سودێـکـم لە ژن هێنــان وەرگــرت؟! هەر مەینەتی‌بوو، خۆزگە ژنم نەهێنایە. .

- نا ڕۆڵــەگیــان وا مەڵێ. . ژن ڕونـاکی ماڵـە . . ژن ژیانی تەمەنیساڵە . . بەڵام ئەڵێی چی؟!

تۆیش وەکـو باوکـە خێـر نەدیـوکـەت شانست نەبـو. . ئافرەتی ئەمڕۆیش هەروان . . حەز ئەکەن بە تەنیا بژین. . ڕقیان لە خەسوو خەزوور ئەبێتەوە. . ئیمەومانان بۆچی باشین؟!

دایکم ئەڵێ - وەڵاهی ژنم دی بێ بە وێنەی ئەمەم هەر نەدیوە. . ئافرەتی وا هەیە هەزار قات بەم خانم خاسێیەدا ئەشکێتەوەو وەکو ئەم ناکا . . ئەڵێی چی ڕۆڵەگیان بەختت ئەم نمونەیەی ناسی. .

- خۆیشم نازانم بۆ ژنم هێنا ؟! ناچار بوم. . ئەبوایە هەر بم هێنایە. .

ئەم یادەیش ئەڕوا. . . ئەو ڕۆژە کات نیوڕۆ بو. باوکم بەپەلەکوتێ خۆی کرد بە ماڵا. .

- ڕۆڵـەگیـان هیـلاکم. . ئەمـرم خێـرا جێم بۆ ڕاخە. .

دەستێکی نهێنی دڵم ئەگوشێ.

بە پەلە جێی بۆ ڕائەخەم . . جامێ ئاوی بەدەمەوە ئەکەم. پاڵ ئەکەوێ . . نانی بۆ دێنم بەزۆر یەك دوو پاروی بە دەمەوە ئەکەم . . چایەکیشی بۆ دێنم . . خێرا خۆم ئەگۆڕم . . دایکم حاجەت و پیاڵەکان ئەبا بیشوا . . ـ دایە ئاگات لە باوکم بێ ئەچم پسوڵەیەکی بۆ ئەبڕم.

بە پەلە ئەڕۆم. پسوڵەیەکی دکتوری تایبەتی بۆ ئەبڕم . . بەشەقامە چۆڵەکاندا کە بۆنی تەنیایی ڕێبوارەکانی لێ دێ. ئەگەڕێمەوە . . بە دیاریەوە دائەنیشم . ئەو دەستێکی خستۆتە لاڕومەتی و نوقاوە . . دەستەکەی دیشی بەسەر ڕانیدا ڕاکێشاوە . . لێی ئەڕوانم . . بەبێ دەنگی بەدیارییەوە دائەنیشم . سۆزێکی گەرم لەناو دڵمەوە قوڵپ ئەدا . . فرمێسکی خوێناوی لەچاوەکانمەوە دڵۆپە ئەکەن . . چی بیرەوەری خۆشی و ناخۆشیم هەیە لەپێش چاومدا شەپۆل ئەدەن . . شەپۆل ئەدەن و لەبەردەم کە ناری خۆشەویستی کوڕیە بۆ باوکەکەی ئەدا بە تاشە بەردی خەیاڵمدا . . جار جارێش لە کات ژمێرەکەی دەستم ئەڕوانم تاکو کاتی بردنە لای دکتۆری بزانم . . زۆرنابا باوکم چاو هەڵئەبڕێ . . لێم ئەڕوانێ . . بە خامۆشیەکەوە قسەم بۆ ئەکا :ـ ڕۆڵە گیان هاتیتەوە . . ؟!

ـ بەڵێ باوکە گیان هاتمەوە . . پاش ماوەیەکی دی ئەدبەم بۆ لای دکتۆر . .

ـ جا کوڕم سودی چیە؟! من تازە حیسابم ڕۆیشتووە . . من تازە لێ بومەوە لێ بومەوە . . دکتۆر فریام ناکەوێ ئەچمە لایەوە . . دەست ئەخەمە ناو دەستیەوەو ماچی ئەکەم . . هەست بە ساردی دەستی ئەکەم . . وەکو جاران سەرم ئەنێمە سەر سینگی و بە پەرۆشەوە ئەگریم . .

ـ تکایە باوکە گیان . . خۆت سەغڵەت مەکە . . ئینشاءالله چاك ئەبیتەوە . .

ـ نا . . ڕۆڵە گیان تۆ دڵی خۆت سەغڵەت مەکە ـ ئاگات لەخۆت بێ . . بێ دڵی خۆت مەکە . . هەمویش گیای مردنین . . بچۆ بە شوێن ئەو ژنەیشدا بیهێنەرەوە . .

ـ بەڵام ئەو دڵی تۆی ڕەنجان لالوت بو لێت ئیتر چۆن بەدڵمابچێتەوە؟!

ـ ڕۆڵە گیان ئەو شتانە هەر ئەبێ من قەیناکە لەبەرتۆ گەردنی ئازاد ئەکەم تۆیش لەبەر خاتری من و ئەو مناڵە ساوایە بچۆ بیهێنەرەوە . .

ـ خاتری تۆ لەسەرسەرم . . ئینشاءالله کە چاك بویتەوە. بەیەکەوە بە شوێنیا ئەچین . .

ماوەیەك باڵی خامۆشی بەسەر هەر دولامانا ئەکێشێ . . سەرم هەڵ ئەبڕم . وا هەست ئەکەم هەموو شتێك کۆتایی هاتووە . . بە دەنگێکی لاوازەوە دایکم بانگ ئەکا . . دایکم دێ بە هانایەوەو باوکم وەسیەتی بۆ ئەکا ـ ئافرەت گەردنم ئازاد کە ترسی مردنم لێ نیشتووە . . بوکەکەم هەر نەبینیەوە . .

ـ ئینشاءالله نامریت ئەی من بۆ کوێ بچم؟!

ـ تۆ لە لای « . . . . . » گیان بمێنەرەوەو ئەو کچە بێنەوە . .

تەماشایەکی کات ژمێرەکەی دەستم ئەکەم . . کاتی دکتۆر هاتن نزیك بۆتەوە . . بە باوکم ئەڵێم خۆی ئامادە بکا . . بەمن و دایکم هەڵی ئەسێنین . ئەیبەینە دەرەوە . . پێڵاوەکانی بۆ دائەنێم لەپێی ئەکا . . گۆچانەکەی ئەدەمە دەست . . وردە وردە ئەڕۆین ـ لەڕێگا لەسەرسوچی کۆڵانەکە ڕائەوەستێ . . دەست بە گیرفانیدا ئەکا . . ـ هانێ ڕۆڵە گیان ئەوە شك ئەبەم با لای تۆبێ.

بەزۆر تۆزێ پارەی لە کیسە ئاخنراو ئەکا بە گیرفانمدا . . لە شەقامەکە نزیك ئەبینەوە . . دەست لە تاکسیەك ڕائەگرم . . دەرگاکەی بۆ ئەکەمەوە . . ئەچێتە ناوەوە ـ لە

پشت ملی ئەڕوانم زەردییەك پێستی ملی داپۆشیوە ـ ترسێك دڵم داگیر ئەكا . . تەزوویەكی شەپۆل شكاو بەقاچما دێ . . بەدوایا ئەچمە لایەوە دائەنیشم . . بەسستیەكەوە دەرگاكە دائەخەم ـ بۆ لای دكتور «. . . . . . .» لەبەر سجن . .

تاكسیەكە ئەڕواو لەبەر عیادەی دكتور «. . . . . .» ڕائەوەستێ . . بەپیاپلیكانەكەدا بەزۆرە ملێ سەری ئەخەم هەست بە قورسایی ئەكەم . . «مرۆڤ كە لەمردن نزیك ئەبێتەوە لەشی قورس ئەبێ . . ڕەنگی پێستی ئەگۆڕڕێ . .» ئەچین دائەنیشین . . یەكەم كەس ئەچینە ژوورەوە . .

ـ سەلامن علیكم ـ علیكم السلام . . فەرموو لەوێدا پاڵ بكەوە . .

«دكتۆرەكە دەست بۆسیسەمە چەرم داپۆشرراوەكە ڕائەكێشێ . . من جلەكانی ئەكەمەوە. پاڵی ئەخەم دكتۆرەكە دێتە لایەوە . . پشكنەرەكە بەگوێیا هەڵئەواسێ . دەست بە «فحص» كردنی ئەكا بەپشتا . . بە دەما ئەیگێڕێ .

ئینجا بە ئامێری پاڵەپەستۆكە پلەی پاڵەپەستۆی ئەگرێ . .

ـ هەڵسە . تۆ ئەبێ لە نەخۆشخانە بكەوی . . دڵت نەخۆشەو پاڵەپەستۆیشت بەرزبۆتەوە . . ئامێرەكە ئەپێچێتەوەو لەسەر ڕەچەتەكە ئەنوسێ .

ـ دكتور هیوای ژیانی هەیە؟!

ـ هانێ ئەوە لە خەستەخانە لەقاوشی پیاوان ئەیخەوێنم ڕەنگە بژی . .

ڕەچەتەكەی لێ وەرئەگرم و ئەچم باوكم ئەپێچمەوەو دێینە دەرەوە . . بە پلیكانەكانا دێینە خوارێ .

بە تاكسیەك بۆ قاوشی پیاوان ئەیبەم . . دكتور دیار نیە . . لە سەر قەڵەوێرەیەك ڕای ئەخەم و قاوش بەقاوش بەدوای دكتۆرا ئەگەڕێم . . دواجار دكتورە فەنی لەژووری سستەرەكان بە پێكەنین دێتە دەرێ . . بەرەو ڕوی ئەچم . .

ـ دكتور فریا كەون . . باوكم هیلاكە . . خەریكە ئەمرێ .

ـ بڕۆ وا هاتم . .

ـ ئاخر خەریكە ئەمرێ . .

بە پەلە دكتورە فەنی لەگەڵ خۆما كێش ئەكەم . . ئامێری پشكنینەكە بەگیان و لاشەیا ئەگێڕێ . ئەم لای ئەكا . . ئەو لای ئەكا . . هیچ بێ سوود ئەبێ . دەمێكە لێ بۆتەوە . . كەفێكی سپی لە دەمیەوە هاتۆتە دەرەوە . . دكتۆرەكە ئەڵێ

ـ بەداخەوە . . زۆریش بەداخەوە فریای نەكەوتین . .

ـ یەعنی هیچ . . باوكم مرد . .

باوكم مرد . . مردو بەخامۆشی بەجێی هێشتم . . هەر بەتەنیایی سەری نایەوە منیش بە تەنیا هەر بە تەنیایی تەرمەكەیم بۆ دایكم بردەوە . . هەربە تەنیایش بەرەو سەیوانی گۆڕستان بەڕێم كرد . . هەربەتەنیایش لە پرسەدا بۆی دانیشتم . . چونكە كە دەوڵەمەندێك ئەمرێ هەزارو یەك مەیخۆر بۆ گۆڕستان بەدوایەوەن . . لەپرسەدا بۆی ڕائەوەستن . . كەچی كە هەژاری شارێك ئەمرێ ڕەش وڕوتی شاران نەبێ دوای ناكەون . . لەپرسەدا ئەمان نەبێ كەس نابینی بۆی دانیشێ هەروەك چۆن ئێستا منی تەنیا دانیشتوم و لەوێنەكەی ئەوو ڕەشپۆشی دایكم ئەڕوانم . . .»

باوەگیان بڕیا لات بوومایە كە مردبیت .. هەزاران رەحمەت بباریتە بەسەرتا
لەو دنیایەدا ئەمە ساڵێتەوە [illegible] لەو دنیای تردا دەمەسپێرەوە .
2 December
1985 ,



● کاکەی فەللاح ●

برای من و
باوکی دێرین!
چاك ئەزانم
لەو ڕۆژەوە کە گلاوی
کە گردەنشین کراوی
کە کەوتویتە بەر شەپۆلی تیژی ژیان
لە قەڵبەزەی پێکەنینەوە بۆ گریان
ئاگام لێ‌یە دڵت تەنگە
خەم وەك شارە زەردەواڵە
لە ناخی تۆ وررووژاوە
ویزە ویزو ژاوە ژاوە
ڕۆژی رووناك شەوە زەنگە
ژیانێکی تفت و تاڵە
بەڵام . . . بەڵام
کاکی برام

چاوم لێ‌یە

ورەی تۆی بەسەر دا زاڵە
هەرکە سیمات ئەخوێنمەوە
چەشنە زاتێ ئەبینمەوە
ئەڵێ: دەرفەتی ژینەکەم
تەمەنە زۆر شیرینەکەم
با کەمیش بێ
باخەمیش بێ
پشت بە بیرم، بە هیواکەم
ئەو بەفر بێ من چیاکەم

ئەڵێ: هەوێنی ئەم ژینە
ورەو کێشەو نەبەزینە
دڕکی یەئس و نائومێدی
پێ‌شێل ئەکەم
ئەبێ بژیم، ئەبێ بژیم
بۆ وەفای وەفا شیرینم
بۆ چاوی گەشی دێرینم

# چەن ساتێ خۆشی



● کمال غەمبار ●

لە کاتێکا، کات ژمێر شەش و نیوە
تۆزو خۆڵ ئاسمانی بەغدای تەنیوە
بەنیازی چوون لەبۆ «کازم» ئەو حەلە
بۆ فەرمانی ئەرۆیشتین بەپەلە
سواری پاسێکی شەق وپەق بووین رێك کەوت
لە تێکقژان ریزی دوایمان بەرکەوت
پێش ئەوەی ئۆتومبیلەکە گرەی بێ
دیمان شۆخ و شەنگێ بۆلای ئێمە دێ
وا دیار بوو لەعەباوە ئاڵا بوو
هەر بەتەنیا دەموچاوی واڵا بوو
لەدوورەوە ئەهات بەرەوتی ئاسك
ئەلەراوە وەك نەونەمامی ناسك
باڵا بەرزی رێکوپێکی وەك چنار
ئای لەلەنجەی ئاوازی کەمان و تار
هەر یەکسەر هات کە بە ئۆتۆمبیل گەیشت
بە ئەسپایی لەبەرامبەرمان دانیشت
وەك بلێی وا دانیشت لەبۆ مەبەسێ
دڵی دڵدار گری ئارەزووی هەڵسێ
هەر کە پەنجەی دەرکرد لە درزی عەبا
رایچڵەکانم وەك لێدانی کارەبا

لەژێر عەبا قژی رەش و پەخشانی
وەك شۆڕەبی، شۆڕ بوو وە سەر شانی
دوو چاوی گەش کانیی جادوو نازداری
هەوێن و ئیلهامی شیعری دڵداری
بزەی تەڕی نەرم و نۆڵی سەر دوو لێو
وەك دێوانە منی خستە هەردەو کێو
جووتێ بەهێ لەسەر سینگی نیشتوو بوون
ناسك و خڕ، تازە پێگەیشتوو بوون
لەباخی سینەدا زۆر هێمن و مەنگ
سەریان داخستبوو بێ جووڵەو بێ دەنگ
بەڵام ئەو نازەنینەی جادووگەرە
بە ئەسپایی ئەیخستنە جووڵەو لەرە
هەڵقۆستنەوەی ئۆتۆمبیلیش جارویار
لەبۆ سەما زیاتر ئەیهێنانە کار
پڕ بەدەم هاواریان ئەکرد: بڕوانە
ئەم جووت بەهێیەی بەهەشتی یەزدانە
ئەزانین تۆ کوژراوی دەس لێدانی
بەرامبەرمان خۆت بە مل کەچ ئەزانی
وەك تۆ تاسەی هەڵمژین و گوشینی
شەیدای ماچی بەینی دوو گۆی شیرینی

لە مەزاری زروان دا نامەی هەقی عیسا بلێنەوە

× ×

چیم دەسەڵاتە تا مۆزبەی کەژاڵەکەم
نەکەمە چەپکێ هۆنراوە.
بەتۆی دەلێم: شەوی یەڵدا
لێم دوورە ئەڵقەی چارەنووس
بۆم نایەیت نامەی دەزگیران

لێم زیزە خەنەبەندانی ئاواتەکەم

× ×

کوانێ ئاوات، ئارامی گیان
تابەرەو کوێستانم ببا
تا چیتر پەنجەی غوربەتیم نەکرۆژم و
گۆرانی دەمەوئێوارەم
لەخەندە لێوی کیژۆڵەیەك نەبینم

× ×

گومانم لەوەی دانەبوو
دەزگیرانم بێ وەفابێ
دڵێ سەر شێت چاوەنوار بوو
هۆ دەزگیران لە گەڵما بژیت و بمریت
نەك لە دەریای خۆشەویستی بمخنکێن. . .
تاکو ئێستا نائومێدبم لە ئاواتم
چەرخی سپڵە
پێم ببارێنێ فرمێسکم هەر وەك باران

× ×

ئێستاش گۆرانییەکەی خۆم ئەلێمەوە
خۆشەویستی عەزابێکە لە دڵەکەی من
ریشەی گیانم هەڵ ئەکێشێ
شادیم نەدی لە گوڵی دەم بەهارەکەم
تا ئێستا باخچەی تەمەنم
پر بکەم لە گوڵی شیعردار



لە دەریای شینێ بێ‌بن دەچێت
چۆن چارۆگە گەشتم بەرەو کیشوەر دەبرد

× ×

گەر دەمزانی خۆشەویستی
خودای شەرە، لە ژان دەچێ
تامی شادییم نەدەویست
لە گوڵەکەی دەم بەهارم
ئای دڵداری چەند کەسادی
ئەڵقەی پەنجەی چەند دڵدارت فرێدا
چۆن بەدوای کیژۆڵەیەکی کوێستانی
دەبووم بە کورە کۆچەرێ
دەبێرەوە ئەی چارەنووس
نامەی دەزگیرانم بە دەنگێکی بەرز
بۆ بخوێنە . . .تا فرمێسکم بکەم بە شاشیعرێك و
دڵدارەکان لە کاتی ئامێزگرتنا
بۆ یەکتری بلێنەوە. .

# دیاریەکەی "هەڵمەت" شاعیر

لە بازاڕی وشەی جوانا
وشەی بە کەڵکو شایانا
ویستم دووانێ پێک بێنم
هەڵمەتی شاعیر بدوێنم
یا دیاریەکەی هەڵسەنگێنم
توزێکیش راز بدرکێنم
چەندە بازاڕەکە پڕ بۆ
وشەی بە دڵ قاتو قڕبو
لەکوێ وشەی وەهام بۆبێ
پڕ بە پێستی ئارەزو بێ
چاوەڕێبام بهاتایە
دەبوا نامە نەنوسرایە

★ ★ ★ ★

گڕی قینی داگیرکەران
هەڵقە لە گوێچکەو نۆکەران
بە کڵپەوە هێرش دێنێ
تا وشەی جوان بسوتێنێ
بۆیە جارجار پەنهان ئەبێ
لە بازاڕا گران ئەبێ
بەڵام دوژمن بیری خاوە
پەتی فێڵی داپساوە
گوڵی جوانی بیرو هەستم
وشەی پیرۆزی مەبەستم
لەناو باروتا ڕواوە
بە پشکۆو گڕ ئاودراوە



ئاگر ئاگر ناسوتێنی
کلپەی زیاتر پێ ئەسێنێ

★ ★ ★ ★

عەشقی چاوی دولبەرێکە
ئوفی زولمی گولبەرێکە
هەردوو تێکەڵاوی لەشن
لە ناو موخ و خوێنێ گەشن

★ ★ ★ ★

گەردەلولی روی سەرزەمین
هەموی هەڵکا لێم زور بەتین
زور بە توندی بم هەژێنێ
دەست و قاچم بپەرێنێ
وەك قنگلاشکە بە هەوادا
هەڵم بدا بەم لاولادا
قەت ناتوانێ پەرەی گولم
گولی تولەو عەشقی دلم
گەلا یەکی هەڵوە رینێ
تا دواهەناسە ئەمێنێ

★ ★ ★ ★

وەکو بێژەن لە زیندانا
یاوەك یەعقوب لە کەنعانا
ئەو پەیامی دوس و لفی
ئەمیش کراسی یوسفی
منیش دیاریەکەی هەڵمەتم
یەکە دەرمانی مەینەتم
عەشقی تازە کردینەوە
بۆ قوربانی بردینەوە(1)

★ ★ ★ ★

دیاری شاعیر گەوهەرێکە
هونەرێکی هونەرێکە
ئەو هونەرەی کەوابلێ:
(بۆ حەبیبەو خاك و گولێ)
بیانەوێ و نەیانەوێ
رۆژانێکەو دەردەکەوێ
(نالی) بە شادی دێتەوە
بۆ شارەزور دەچێتەوە
واتە منیش بیمارێکم
تینوی دیاری و دیدارێکم
هەرچەندە دولبەرم دووربێ
وەك (حەبیبە)ی شارەزوربێ
بەندەو پێکراوی دوژمن بێ
رۆژێك ئەبێ هەر بۆ من بێ

★ ★ ★ ★

دەبێ دیاری شاعیر چی بێ
کە دیاری وام قەت نەدیبێ؟
پەیامێکی هەوارێکە
دەنگی گوێزو هەنارێکە

= 1979 =

(1) ئەو تاکە هەڵبەستە لە هونراوەی (بە سەر پێوە)شدا هاتوە، کە لە رۆژنامەی هاوکاری ژمارەی 1984/5/19دا بلاو بووەوە.



# من و نیشتمان

گوڵ و دوژمن و من
هەموومان ئەمرین
گوڵ لە جوانیا
دوژمن لە رقا
منیش لە خۆشەویستی تۆدا ئەی نیشتمان...

* * *

هەوروبەفرو من
هەموومان ئەتوێنەوە
هەور لە ساردیا
بەفر لە گەرمیا
منیش لە دووری تۆدا ئەی نیشتمان...

* * *

مەل و دڵ و من
هەموومان ئەفرین



● ئەکرەم مەحمودسەمین ●

مەل بۆ لانەکەی
دڵ بۆ یارەکەی
منیش بۆ باوەشت ئەی نیشتمان

* * *

بولبول و پەروانە و من
هەموومان شێتین
بولبول بۆ سەربەستی
پەروانە بۆ ئاگر
منیش بۆ تۆ ئەی نیشتمان...

* * *

مانگ و هەتاو و من
هەموومان وێڵین
مانگ بە بێ شەو
هەتاو بە بێ رۆژ
منیش بە بێ تۆ ئەی نیشتمان...

* * *

برسی و تێرو من
هەموو چاوەڕێن
برسی بۆ نان
تێر بۆ پارە
منیش بۆ خاکی تۆ ئەی نیشتمان...

* * *

ئاو و درەخت و من
هەموومان سووتاوین
ئاو بۆ درەخت
درەخت بۆ زەوی
منیش بۆ ئاو و درەخت ئەی نیشتمان...

* * *

ئەردو ئاسمان و من
هیچمان بەیەك ناگەین
ئەرد بە ئاسمان
ئاسمان بە ئەرد
منیش بە تۆ ئەی نیشتمان



# کچا ئاکرێ

● عبدالرحمن حاجي ●

پەردێت شەڤێ هەر ئەز لاددەم
لبەر فەنەرا کەزیا باددەم
رۆندکێت گەرم هێدی راددەم
ژ بەر ڤەمانا یارێ دلدار

× × ×

چاڤێت خو لئاکرێ دگێرینم
جووت جووت ئەڤیندارا دبینم
خر پشاهی‌نە بەس ئەز زینم
مایمە لهیڤیا مەمێ هەژار

× × ×

نزا کەنگی ئەو یار دێ هێت
وەك هەیڤێ لپشت چیا دێ هەلێت
یان وەك کانیێ کەنگی دێ زیت
دا ئەز ڤەخووم وێ ئاڤا سار

× × ×

قەت ناشکێنم ئەز پەیمانێ
هەر دێ مینم تا بەیانێ
بەلکی ئەز بگەهمە رامانێ
گەلاڤەیژ بێت وەکی هەرجار

× × ×



# سیناریۆی

# دووکەس لەگەڕۆکێکدا

**نووسینی: ناظم حیکمەت**
**وەرگێڕی: احمد محمد اسماعیل**

## -بەشی سێیەم-

**علی**: جاریك هیچ ناگووترێ.

ڕێگا خۆڵاوی‌یەکە. ئۆتۆمبیلەکەی گولسوم دەبینرێ لەڕێگاکە. دوا بەدوای ئەوەوە تاکسی‌یەکە دەردەکەوێ.

چێشتخانەکەی محمود. مێزێك بۆ خدیجە، فاتمە، فەیزی، علی، شوفێرەکە احمدو چەند مێوانێکی‌کە تەرخان کراوە. محمود کەمێ دڵتەنگ دیارە. احمد وەك بییر لەشتێ بکاتەوە وایە.

**خدیجە**: (بەئەسپایی بەاحمد دەڵێ). دڵی‌خۆت تەنگ مەکە. حلیمە نایەت.

شووتی فرۆشەکە. شووتی‌یەکی بەدەستەوەیە، دێتە ژوورەوە.

**شووتی فرۆشەکە**: ببورن کە بێ ئەوەی کەس بانگم بکات هاتووم. شووتیم بۆ احمد هێناوە.

احمد راستەبێ هەڵدەستێ، دێنێتی بۆ لای مێزێك.

**احمد**: لێرەوە (ڕێگای پیشان دەدات) بەخێر بێی سەر هەردووك چاووم.

**شووتی فرۆشەکە**: ئیستا منیش فێری شووتی هەلبژاردن بووم. باشە دەتوانی پێم بڵێی ناوکی ئەم شووتی‌یە چ ڕەنگە.؟

**احمد**: (شووتی‌یەکە بەدەستەوە دەگرێت) سپی‌یە.

**شووتی فرۆشەکە**: نەتزانی. ڕەشە.

**علی**: بیشکینن بزانم.

احمد شووتی‌یەکە شەق دەکات. ناوکەکەی ڕەش دەردەچێت.

احمد: بەڵێ تا شووتیش ناتوانم هەڵبژێرم.

گوڵان ئۆتۆمبیلەکەی گولسوم.

نوری: تکایە راوەستن..

گولسوم: (بە سەرسوڕمانێکەوە) بۆ، چی بووە؟

نوری: راوەستن. بەناوی منەوە داوای لێبوردنیان لێ بکە. من نایەم.

گولسوم: با بتان گەیەنم.

نوری: پێویست ناکات.

گولسوم ئۆتۆمبیلەکەی رادەگرێت. نوری دادەبەزێت.

گولسوم: هیوادارم چاومان بەیەك بکەوێتەوە.

نوری: بێگومان.

شەقامێك لە گەرەکێکی دەوڵەمەند. گلۆپی سەرجادەکان ئەو ناوەیان کردۆتە رۆژی رووناك. نوری بە شەقامەکەدا رێ دەکات، بیر دەکاتەوە.

ژوورەکەی علی. ژوورێکی پاك و تەمیزە.

دەنگی عزیز: وەستا علی لەم ژوورەدا دەژی.

کاتێ یەکە یەکە ناوی شتومەکەکانی ناو ژوورەکە دەبرێ کامیراکەش پیشانیان دەدات.

دەنگی عزیز: (بەردەوام دەبێت) ئەو گۆچانەی کە بینیتان احمد بەدیاری بۆیهێنا. (گۆچانەکە بەدارەوەیە) احمد بەدەستی خۆی بۆی کرد. ئەم سەرینە دەست و دیاری پووری خدیجەیە. ئەو گوڵدانە کە گوڵە قەرەنفولی تێدایە. دەبێ بزانن هی کێیە. دیاری دەست محمودە. ئەو تابلۆیە دەست کردی منە. دەزانم چاکم نەکردووە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم تابلۆیەم لە دڵا شیرینە. ئەو سێ کتێبەی سەر رەفەکە، علی لە کۆنە کتێب فرۆشێك سەندونی. هەرچی ئەمەشە (کامیراکە مەقاڵەیەك پیشان دەدات) دەست و دیاری فەیزییە.

ئەو پایپەش نوری بۆی هێناوە...

علي دەردەکەوێ دانشتووە. احمدو خدیجە دیاردەدەن، دواجار محمود، ئەمیان لەسەر تەختەیەك دانشتووەو سەری ناوەتە نێوان هەردوو لەپیەوە. خدیجە، لە جانتاکەیدا بە دوای شتێکدا دەگەڕێ، قەرەنفولێك لە جانتاکەیدا دەردێنێ.

خدیجە: چ ئافرەتێکی سەیرم.. (بەر بەلای محمودەوە دەکات) هەر بۆ ئەوەی بە تۆی نیشان بدەم ئەمەم لە جانتاکەم ناوە. ئێستە کەوتە بیرم.

محمود: (سەری بەرز دەکاتەوە) چیت گووت؟

خدیجە: (قەرەنفولەکەت پیشان دەدات). تۆ سەرت لێ دەردەچێت، هیچ قەرەنفولی وات بینیوە.

محمود: نەخێر (دووبارە سەری خۆی لەچنگ دەگرێت).

خدیجە: (لە جێگاکەی خۆی هەڵدەستێ): من دەڕۆم. بەرەو دەرگاکە دەڕوات. دەرگاکە دەکاتەوە. لەگەڵ نوریدا لووتیان دەبێتە تووش یەکترەوە.

خدیجە: ئاە... نوري...

هەموویان تەماشای نوري دەکەن.

نوري: مەرحەبا پووریێ خدیجە. (دێتە ژوورەوە).

ئەم کاتەتان باش. (ئەم کاتەت باش).

کەمێ دواکەوتم. ببورن..

محمود: دانیشە.

خدیجە: ئێستاش هەر دەبێ بڕۆم. ئێوە بۆخۆتان دانیشن.

خدیجە دەڕوات.

گەرەکێکی کۆڵانەکە. فەیزی لەپێش چاخانەکەدایە، نەرگیلە دەکێشێ. کە خدیجە بەویدا تێپەڕدەبێت بەسەر بانگی دەکات.

فەیزی هەڵدەستێ و دێ بۆلای.

فەیزی: جولانەوەی وادەکەی (لاسایی خدیجە دەکاتەوە).

کچی هەژدە ساڵان ئێرەییت پێ دەبات.

خدیجە: گەڕایەوە...

فەیزی: زۆر سوپاس بۆ تۆ خدایە..

ژوورەکەی علي، ئەوانەی دانشتوون لەبەر هەڵاو بوخ عارەقەیان کردووە.

علي: من لەو بڕوایەدام ئەو پارتییەی کەدەسەڵات بەدەستەوە

دەگرن، هیچ جیاوازی یەکیان لەگەڵ ئەماندا نییە...

نوري: من وای بۆ ناچم. پێش هەڵبژاردن کۆمەڵێ بەڵێنیان داوە.

احمد: ئەو بەڵێنانە بەڵێنی پێش هەڵبژاردنە..

رفیق: من لە نزیکەوە رفیق یەك دەناسم.

علي: باشە.. تۆ چۆن لە رفیق ئەفەنی گەیشتووی؟

محمود: ئێمە باسی کچەکەی ناکەین مەبەستمان رفیق خۆیەتی.

نوری بێدەنگ دەبێت.

علي: بە احمدم گرتووە، وا بەتوۆش دەڵێم «رووناکی» سەرلەنوێ دەردەکەینەوە. ئەمجارەیان بەناوی ئاشتی خوازانەوە دەردەچێت.

نوري: تێگەیشتم. کێ دەبێ بە سەرنووسەری گۆڤارەکە؟

علي: تۆ.

نوري: تێ گەیشتم.

علي: هەرچی «احمد»ە دەبێ بەسکرتێری نووسین.

نوري: تێگەیشتم.. یانی دەبێ بە گۆڤار..

احمد: پروفیسور أمین بە سەرۆکی گۆڤارەکە دانراوە.

نوري: جێگای من نابێتەوە لە کۆمەڵی وادا.

محمود: تۆ لووتت بەرز بووە کورم.

نوري: مەسەلە لووت بەرزی نییە.

علي: مەسەلە فەرمان پێکردنە.

نوري: من لە ژێر فەرمانی کەس دا نیم.

محمود: دایکت ماری بهێنایە لەجیاتی تۆ.

نوري: باوە.

محمود: خەریکە دەرشێمەوە.

نوري: منێ کە باوکی خۆمم لێ بێزاربێ، کەس گوناهبار ناکەم. کەستان چاوتان بەمن ناکەوێ.

(هەڵدەستی بڕوات)

احمد: (دەکەوێتە شوێنی) نوری..!

احمد لەدەرگا نوری دەگرێت.

احمد: چیبووە؟ بۆ کوێ دەڕۆی؟

نوري: تۆ هەقت بەسەرمەوە نەبێت.

احمد: یانی چی؟ ئیشی تۆ هی من، هی هەموان نییە؟

نوري: ئوف.. شۆرت کرد.

احمد: برام. نوری..

نوري: بەسیەتیو دەست لە یەخەم بەردە.

احمد: گوێ بگرە. لقێك کە برایەوە، جارێکی کە نابێتەوەلقەکەی جاران.

نوري: ئەوکاتە لە جیاتی ئەوەی ببمە لقەدارەکە، پێم خۆشە ببم داردەستێك.

احمد: (دەستی نوری دەگرێت) هۆشت بێتەوە.

نوري: بەرم بدە. (دەستی خۆی رادەوەشێنێ. خێرا لەدەرگاکەوە دەردەچێت).

احمد: ئەمیش ئاوها.. ناوکەکان وەکو من بۆیان دەچم وا دەرناچن!...

علی پاپەکەی دەنێتە لالێوەوە.

دەنگی عزیز: بۆ ئێوارەکەی، بۆ جاری دووەم نوري دڵە کوتەکەی تووش هات.

نوری لە ژوورێکی نەخۆشخانەدایە. تلفونێك بەسەر کومیدییەکەی ژوور سەریەوەیەتی. کە هەناسە وەردەگرێت هەست بەئازار دەکات. تلفون هەڵدەگرێ.

دەنگی عزیز: وا دوو دڵ دیارە، دەیەوی بۆمن یاخود بوگولسوم تلفون بکات..

تلفونەکەی بەدەستەوەیە، کەمێك رادەوەستی، دواجار نمرەکان با دەدات.

نوري: هالووو.. گولسوم... منم نوری... «........»
لە نەخۆشخانەی «........» ژووری 75
دوکتۆرێك لەگەڵ خۆتدا بێنە!

ژوورەکەی رفیق. رفیق و نوریو گولسوم

رفیق: (بەنوری) رێکەوتنی یارمەتی سوپایی مۆر دەکرێت. لەم بارەیەوە سبەی ستونێك بنووسە.

نوري: بایەکێکی کە بینووسێ... من...

رفیق: (قسە بەنوری دەبڕێ) باپێت بلێم

دەبێ بیروباوەڕی لەمەو پێشت بە یەکجاری‌و تا ماوی لەبییر بەریتەوە.

نوري: من لە گەلێ شتدا لە گەڵتام ... بەڵام..

رفیق: ووتارەکە بنووسە، بۆ ئەوەی زیاتر بە هێزبێت بیروباوەڕی جارانیت تێکـەڵ بکـە. دانیشـە، ووره لەشـوێنـەکـەی من دانیشە... (دەردەچێ).

گولسومیش دەیەوێ دەرچێت.

نوري: (بەگولسوم) من بەسەربەست دەزانی؟

گولسوم: (بێ ئەوەی تەماشای بکات).. بەڵێ...

نوري: بۆ؟

گولسوم: لەبەر ئەوەی زوو خۆت بەدەستەوەدا.

نوري، رەنگی زەرد هەڵدەگەڕێ.

گولسوم: من وام دەزانی ئێوە خەڵکی سەر ئەستێرەیەکی ترن. بەڵام بەهەڵەدا چووم. خوا

بەرەکەت لە ئێوەمانان بدات. من دەمویست نوری یەکی تر بیت.

نوري، چاوەکانی پڕ لە ئاو دەبن. بۆ ئەوەی گولسوم هەستی پێ نەکات پەنجەرەکە دەکاتەوەو تەماشای دەرەوە دەکات.

گولسوم: تەماشـای ئۆتۆمبیلەکەت دەکەیت؟ ئەوی کەت ئەمرۆ فرۆشت و ئەمەشت کری؟ (دێتە لای پەنجەرەکەوە) ئۆتۆمبیلێکی جوانە، ...

نوري خێرا ئاوڕی لێ دەداتەوە، دەیەوێ شتێك بلێ.. بەڵام خێرا دەروات بۆلای مێزەکە.

گولسوم: بنووسە دەی بنووسە..

نوري دادەنیشێ. سەری خۆی لە چنگ دەگرێت.

گولسوم: بنووسە (دەردەچێت).

چێشتخـانـەکـەی محمـود . نوری نان بۆ کرێکارەکان دادەنێ.

لەپشت مێزێکەوە. فەیزی‌و احمدو علی دانشتوون.

دەنگی عزیـز: ووتـارەکـەی نوری یان خوێنـدەوە، هەمـوویـان شەرمەزار بوون، توڕبوون. بەڵام کەس باسی نەدەکرد.

محمود، نان دادەنێ. شێواوو خەفەتبار دیارە.

دەنگ. عزیز: خەڵکی بەزەیی‌یان بەمحمود دەهاتەوە..

احمد: (هەلدەستی) من دەڕۆم.

علي: منیش.

فەیزي: منیش دەروم.

علي: محمود خوا حافیز.. ئێوارە وەرە،

فەیزي: پیرە فاسولیا بەتام بوو. دەستت نەڕزێ.

احمد: خوا حافیز مامە.

محمود: بەخێر بێن (بانگ دەکات) احمد!

هەموویان رادەوستن.

احمد: فەرموو.

محمود: بزانە چ دەڵێم.. ووتارێکی وای دژ بنووسە. (فـرمێسـك بەچـاویـا دێتـە خوارەوە) ئەم بەرازە.. چۆن ئەو چەنـدرمـەیـەم کاتی خۆی دارکـاریکرد لەئاوایی، لەگەڵ دایکیا گوایە رێك کەوتبوون، ئەئاوا لێی دەدەم.

احمد: باشە... تۆ خۆت نارەحەت مەکە.

محمود: (باوەش بە احمددا دەکات) هەر خۆشبی کوڕم.

علي‌و احمد دەردەچن.

علي: گوێی مەدەرێ.

احمد: هەروا ئاسان نییە، تۆ بلێ دوستێکمان مرد.

دەنگی عزیز: سەربازێکی زۆری بیانی هاتوونەتە وولاتەوە. بۆ گەڕەکەکەی ئێمەش هاتن.

گەڕەکەکە، منالەکان لەکەللەی سەر دەقیژێنن «هاتن هاتن!» ئەوانـەی لە بەردەم چاخـانـەکـەدا دانشتبـوون چوونە ژوورەوە. دەرەبانەکانیان داخست. ئەو ئافرەتانەی کە بۆسەرکانی دەچوون گەڕانـەوە. فەیـزی دوکـانـەکـەی دەگـرێت. لە دەم کولانەکە دە سەربـازی بیـانی دەردەکـەون. گۆرانی‌یـەکی خۆیان لە کەللەی سەر دەڵێنـەوە. بەڵام کە بێ‌دەنگی‌و چۆل و هۆڵی گەڕەکـەکـە دەبینن دەیبرنەوە.

ماڵی خدیجە. خدیجە جل دەشۆرێ. مناڵێك بەپرتاو خۆی دەكا بەژوورا.

**مناڵەكە:** هاتن...!

**خدیجە:** چی هات؟

خدیجە جلە چڵكنەكان لە تەشتەكە دەردێنێ، بە تەشتە ئاوەكەوە دەرواتە دەرگا. لەو كاتەدا سەربازەكان بەدەر دەرگادا تێدەپەڕن. خدیجە ئاوی ناو تەشتەكە بەسەریانا دەكات

**سەربازی یەكەم:** هێی. ئەمە چی‌یە؟

**سەربازی دووەم:** كەوتینە چ شوێنێكەوە؟ بەڵام لێتان دا..

یەكێ لەسەربازەكان دەست لە خدیجە بەرز دەكاتەوە. خدیجە بەر لەو دێتە دەست و تەشتەكە دەكێشێ بە سەریا. سەربازێكی كە لەولاوە پاڵ بە خدیجەوە دەنێت. شوتی فرۆشەكە یەك دوو شوتی‌یان تێ دەگرێت.

**شوتی فرۆشەكە:** (هاوار دەكات) وەرن. فریامان كەون...

هاتووچۆكەرانی چاخانەكە دەست بە بەرد بارانیان دەكەن.

دەنگی شاوری پۆلیسێك دێ.

دوو پۆلیس بەكاوەخۆ نزیك دەبنەوە.

**پۆلیسەكان:** (بەوانەی بەرد دەهاوێژن) ئەوە چی دەكەن؟

(بەدەست هیما بۆ سەربازەكان دەكەن تا دوور بكەونەوە).

سەربازەكان دەشڵەژێن، دوور دەكەونەوە.

ژوورەكەی رفیق. رۆژنامەیەكی بە دەستەوەیە، لەناو ژوورەكەدا پشتاو پشت دەگەڕێتەوە.

**رفیق:** شتێكی سەیرە، ئەوپەڕی گاڵتە پێ كردنە.

گولسوم بە كەیف خۆشی‌یەوە دێتە ژوورەوە.

**گولسوم:** باوە (كەدەبینێ باوكی تورەیە) چی بووە؟

**رفیق:** رۆژنامەی ئەمرۆت خوێندەوە؟

**گولسوم:** نەخێر.

**رفیق:** تەماشایكە بزانە ئەم وێنەیەت پێ جوانە؟

گولسوم رۆژنامەكە لەدەست باوكی وەردەگرێت. بەتەنها وێنەكە پیشان دەدرێت. احمد لە كۆبونەوەیەكدا قسە دەكات

**دەنگی رفیق:** ها چۆنی دەبینی؟

**دەنگی گولسوم:** ئم ئم..

وێنەیەكی كە پیشان دەدرێت. احمد لەگەڵ لادێكاندا قسە دەكات.

**دەنگی رفیق:** ها چۆنی دەبینی؟

**گولسوم:** سەیرە..

**رفیق:** ئێمەش لە رۆژنامەكەماندا، دەنگ و باسی ئاشتیخوازان و چۆن سەرۆكی كۆمەڵەكە چووەبۆ لادێ‌و چی گرتووە بڵاودەكەینەوە.

**گولسوم:** باشە چۆن وا لە (آقشام) ئەم شتانە بڵاوكراونەتەوە؟ كێ چاپی كردوون؟

دەرگا لێ دەدرێت.

**رفیق:** وەرە ژوورەوە.

نوری دێتە ژوورەوە.

**رفیق:** بەڵێ؟

**نوري:** مەسەلەكە ئاشكرابوو چۆن بووە. مصححەكە، كە قوتابی دانشگایەو شەوان لەلای ئێمە كار دەكات، ئەو كلێشەكانی داوەتە چاپخانەو گوایە تۆ فەرمانی چاپكردنیانت داوە.

**رفیق:** ئەو ئاڵچاغە هەر هات و بیدەنە دەست پۆلیسەوە.

**نوري:** باشە، بە سكرتێرەكە دەڵێم.

**رفیق:** (شێت گیر بووە) لەبیری دەكەن. خۆت تەلەفون بۆ پۆلیس بكەو خۆت بیدەرە دەستیانەوە..

**گولسوم:** (بەنوری) خۆتان تێك مەدەن. بڕوا ناكەم جارێكی كە بۆ ئێرە بگەڕێتەوە.

گولسوم، گۆڤاری «رووناكی» دەداتە دەست باوكی.

**گولسوم:** (بەرفیق) تەماشایكە، دوا ژمارەی «رووناكی» احمد لە چەكمەچەكەتی داناوە.

**رفیق:** ئەگەر وا نەبوایە ژیانی ئێستای باوكت وا نەدەبوو.

**گولسوم:** دەزانم.. لەخۆرایی خۆت توورە دەكەی منیش دوڵابی وام پێ باشە. هەروەها لەژیانی خۆشم رازیم. بەڵام مرۆڤی راستم خۆش دەوێت.

هۆڵی نقابەی رۆژنامەنووسان. کەمێ گۆڕانی پێوە دیارە کپ و بێ دەنگە. هەمان هۆڵە. خەڵکێکی زۆر جۆرە دانسێك دەکەن.

مێزەکەی رفیق، گولسوم و نوریو ولی یش دانشتوون.

**رفیق:** کچم بۆ هەڵناسیت دانس بکەیت.

**گولسوم:** ئارەزووم لێ نییە.

**رفیق:** (بەنوری) گولسوم بێزار دیارە.

نوری داوا لە گولسوم دەکات دانس بکەن.

بێ ئەوەی تەماشای یەکتر بکەن بە شێوەیەکی ئوتوماتیکی دانس دەکەن.

**ولی:** (تەماشای نوری دەکات) یەکەم جار کە بۆ ئێرەهات بەڕێوەبەری «رووناکی» بوو.

**رفیق:** بەڵێ.. ئەو کاتانەش ئێوە «وەلی» پارتێکیکە بووی.

**ولی:** ژیان بە خێرایی دەگۆڕێ.

**رفیق:** رات چۆنە دەربارەی بەڕێوەبەری «رووناکی»تازە.

**ولی:** فەرمانێك لە وەزیری ناوخۆوە دەرچووە تا زانیاریو بەڵگەی دەربارە کۆبکرێتەوە بۆ گرتنی.

**رفیق:** قسەی پووچە. من لەم رووەوە لەگەڵ وەزیردا دەدوێم. نامەوێ دوژمنەکانمان بین بە پاڵەوان. (نوری پیشان دەدات) زۆری نەمابوو ئەمیشمان لێ بکەن بە پاڵەوان. لەبیرتە دەتانویست بیکوژن..

**ولی:** لە کوێوە دەرچووی؟

**رفیق:** درۆ نییە... ئێوە واتان دەویست. بەڵام سوپاس کە رێك نەکەوت. ئاخرییەکەی دەساڵتان بۆ سازدا. دیسان سوپاس کەمی تیامایەوە.

**ولی:** زۆر سوپاس کە ئێستا لەگەڵماندایە

**رفیق:** بەڵێ بەڵام احمد جۆرە پیاوێکی کەیە.

**ولی:** بەراستی پیاوێکی جیاوازە.

**رفیق (بەولی):** لەبەر ئەمەیەکە نامانەوێ بێ بە قارەمان. بە بەندکردن چاوی ناشکێ. سەرەکی کۆمەڵەی ئاشتیخوازانیش هەڵناواسرێت..

**ولی:** ئەی باشە چی بکەین؟

**رفیق:** باشترین شت ئەوەیە، ناوی بزڕێنین. دواجار هەموو شتێك ئاسان دەبێت (نزیف بە تەنیشت پەیکەری ئافرەتێکی رووتەوە وەستاوە) ئەو کابرایە ببینە. ئەویش لە ئێوەیە.

ولی تەماشای نزیف دەکات

لە نزیکەوە رووی نزیف نیشان دەدرێت.

شوێنی ئیش کردنەکەی حەسەن. تەنها دوو دەزگای ماوەتەوە. لەو دووانەش یەکێکیان کەسی بەسەرەوە نەماوە.

حلیمە لەسەر ئەو دەزگاکە کار دەکات. حەسەن خۆی دەزووەکان لەسەر دەزگاکە دادەمەزرێنێ.

جار نەجارێك شووشەیەك (رەقی) دەنێتە سەرەوەو پارچەیەك پەنییر دەخاتە دەمیەوە.

**حلیمە:** باوە زۆر دەخۆیتەوە

**حەسەن:** گوێ مەدەرێ.

دەرگاکە دەکرێتەوە. احمد دێتە ژوورەوە.

**احمد:** ئەم کاتەتان باش.

**حلیمە:** (دادەچەڵەکێ) ئەم کاتەت باش.

**احمد:** رۆژانی جەژنیش هەر کار دەکەن.

**حەسەن:** بەتۆ چی؟.

**احمد:** (بەپەیژەکاندا دادەبەزێو دەروات بۆلای حەسەن) باوە من بۆلای تۆ هاتووم

**حەسەن:** من کەی باوکی تۆم؟.

**احمد:** دەمەوی ببی بەباوکم.

**حەسەن:** شتی وا نابێ. دەتەوێ تەنها کچێکم هەیە لەویشم بکەی.

**احمد:** پێم خۆشە هەردوکتان لەلای من بن

**حەسەن:** وەکو دانیی بەخێوم بکەی؟ (دەڕوا بۆلای حلیمە وەك بیپارێزی هەردوو قۆڵی بۆ دەکات بەچەتر). نایدەم، پێتی نادەم

**احمد:** بەڵام بۆ نایدەی؟.

حەسـەن: بە رووت و قووتـیکی وەك تۆی بدەم؟ وەلیـە برۆ.

(شەربەکە هەڵدەگری. وەك رۆژانی منداڵی دەیەوێ بیکێشە بە سەریا. بەڵام پێی بەیەکادێ دەکەوێت).

حلیمە لە جێگاکەی خۆیەوە هەڵدەستێ و دەرواتە لای باوکی‌یەوە

حلیمە: باوە...

سەری باوکی دەنێتە باوەشی‌یەوە

حلیمە: لێرم.. باوە

احمد: (غەمبارە، لەحەسەن نزیك دەبێتەوە)ئەوە چی بوو؟.

حلیمە: هیچ نییە.. برۆ.. دواجا.. دواجا قسە دەکەین.

احمد دەروات.

ژووری نوری، لە رۆژنـامـە «آقشـام». لەپشت مێـزێکـەوە دانشتـووە. نزیف، لەپشت مێـزێکی کەوە خەریکی کارکـردنە.

حسن لە سوچێکەوە کروشکەی کردووە.

نوري: (بەحەسەن) کاروبارت باش نییە ها؟.

حەسەن: بڵێی خراپە بەگم.

نوري: بۆ بەگم پێ دەڵیی. وەکو جارانی بانگم بکە.

حەسەن: تۆ عاقڵێ. ئێستا بەگی.

نوري: باشە چیت دەوێ؟.

حەسەن: ئەو ئاڵچاغە دەست لە یەخەی کچەکەم ناکاتەوە.

نوري: احمد خۆشی دەوێ.....

حەسـەن: من دەمـەوێ بەیـەکێکی دەوڵـەمەند خانەدانی بدەم. کچەکەم کچێکی جوانە. وەك دانەی گەوهەر وایە.

نوري: دەتەوێ خوازبێنی بۆ بکەم.

حەسەن: بەڵکو یەکێ لە دۆست و هاورێ تازەکانی بۆ دەدۆزیتەوە.

نوري: باشە باشە. ئەوەی لەدەستم بێ درێغی ناکەم.

حەسەن: ئەگەر دەتوانی هەندێ پارەبەکۆنە وەستات بدەی.

نوري هەندێ پارەی دەداتێ

حەسەن: خوات لێ‌رازی بێت.

نوري: خوا لەدەمتی ببیسێ.

حەسەن: خواحافیز (بەنزیف) خواحافیز.

نزیف: بەخێر بێی.

حەسەن دەردەچێت

نزیف: احمد داوای کچەکەی دەکات؟

نوري: بەڵێ.

نزیف: سەیرە (لەپرێکا) احمد دەمانچەکەی لەکوێ‌دا دا دەنێت؟

نوري: (بە سەرسورمانێکەوە) لە گیرفانی چاکەتەکەیدا.

نزیف: کاتێ کە کار بکات چاکەتەکەی دادەکەنێت؟

نوري: بەڵێ.

گولسوم دێتە ژوورەوە.

گولسوم: ئەو پیرەمێردە کێ بوو؟

نوري: باوکی حلیمـە یە (پێـدەکـەنێ) دەیـەوێ زاوایـەکی دەوڵەمەندی بۆ بدۆزمەوە.

گولسوم: لەبەر ئەوەی دڵداری احمدە دەزانم درێغی ناکەیت.

نوري: دەست لەکامەرانی کەس وەرنادەم.

گولسوم: (بەنزیف) ئەی تۆ؟

نزیف: وەخت و زروف دەزانێت گولسوم خانم.

دەنگی عزیـز: دارستـانێـك لە قەراغی شاردایـە. کاتی خۆی لەگەڵ دڵدارەکەمدا پێکەوە تیایدا دەگەڕاین ئێستا بێ دڵدارم.

چەمەکە. رۆژێکی خۆشە. حلیمەو احمد پێکەوەن.

بە تولە رێگایەکدا شۆردەبنەوە.

دەنگی عزیز: دەستی یەکیان نەگرتووە..

حلیمەو احمد رێ‌دەکەن.

دەنگی عزیز: یەکەم جارە حلیمە گۆرانی بۆ دەڵێ:

لەناو دارستانەکەدا رێ‌دەکەن. حلیمە گۆرانی دەچرێ.

گۆرانی‌یەکەی تەواو دەکات. ئێستا لە شوێنێکی چەپدان.

احمد لەسەر گیاکە دانشتووە. حلیمەش بەتەنیشتی‌یەوە.

دەنگی عزیز: بێ دەنگن...

احمد چاوی لە چاوانی حلیمە بریوە. احمد دەستی حلیمە

دەگرێت و بە ئەسپایی بۆ لای خۆیی رادەکێشێ... حلیمە چاو دەنوقێنێ.

احمد بە ئەسپایی چاوی ماچ دەکات.

حلیمە: چاوم ماچ مەکە.. دابرانی لە شوێنە...

احمد جارێکی کە ماچی دەکاتەوە.

حلیمە لەسەر گیاکە رادەکشێ. تەماشای ئاسمان دەکات. تەنها لق و پۆپ و گەواڵە هەورەکان دەبینێ.

جێگای کارکردنەکەی حەسەن. گلۆپێکی کز ناوەوەی رووناك کردوتەوە. حەسەن سەرخۆشە. لەبەر خۆیەوە دەدوێ.

حەسەن: تۆ بەدەستمەوە ماوی. وام دەزانی دەبن بەدە دەزگا فراوان دەبنەوە. لە بری ئەم چوکلە دارانە دەبن بەئاسن ولەم گەرەکە وێران بووە دوور دەکەومەوە..

بەتەنها کارگەیەك دادەمەزرێنم. دەستی بەخۆما دێنم و خۆم دەگرمەوە.

بەڵام هیچیان نەبوو.. وا تەنها تۆم بۆ ماویتەوە تۆو کچە نەعلەت لێ بووەکەم. دەی... لە چاوی تۆ لە چاوی تۆو ئەو (لەتۆی شتەکاندا بەدوای بوتڵەکەیدا دەگەرێ).

حەسەن: لە کوێم دانا. لەکوێ؟

دەرگا دەکرێتەوە. لەسەر پەیژەکانەوە حلیمە دەدەکەوێت.

حەسەن نایبینێ، دەخواتەوە.

حلیمە: باوە...!

حەسەن بە ترسەوە بوتڵەکەی دەستی دەشارێتەوە.

حلیمە: هەمدیس دەخوێتەوە؟

حەسەن: نەخێر...

حلیمە: (دێت بۆ لای باوکی) ئەوەم بدەرێ.

حەسەن: کامە؟ (لەپر تورە دەبێت) بەتۆچی کە من دەخۆمەوە... بەڵێ.. ئاڵچاغێکی وەك باوکت نەخواتەوە چ بکات؟

کچ سۆزانیو باوك سەرخۆش.. (دەست بە کچەکەیەوە دەنێت.. برو برۆ بۆ لای دۆستەکەت...

حلیمە: باوە! تکات لێ دەکەم باوە. هەڵسە با پێکەوە برۆین بەتەنها جێت ناهێڵم.

حەسەن: من.. من.. دەست لەمە هەڵناگرم...

... دەیکوژم (بەپرتاو دەروا دەربچێت).

حلیمە: (بەدوایا رادەکات)، بابە راوەستە.

حەسەن بوتڵەکەی بە دەستەوەیەو لە سەرووی پەیژەکەوە رادەوەستێ. حلیمە چەند پایەیەك لە خوارەوەی ئەوەوە راوەستاوە.

حلیمە: باوە گوێم لێ بگرە.. من.. من..

حەسەن: دەیکوژم! (لەکچەکەی دەدات).

شەوە. چاخانەکە سیخناخە، لەناو قەڵەباڵغی یەکەدا فەیزیو محمودو علی، دیارن. لە ولاترەوە نزیف دانشتووە. حەسەن بە لەتردان بەرەولای محمود دێت.

فەیزی: (بەحەسەن) فەرموو چایێك بخۆرەوە.

حەسەن: نامەوێ. خوا بەرەکەت نەدات (بەعلی) کوا احمد کوا، کوا ئەو بەرازە، کوا سەروکەکەتان.؟

علي: بۆ چیبووە چی بووە؟

حەسەن: دەست لەیەخەی کچەکەم ناکاتەوە. (بە خەڵکەکە) نەڵێن گوێمان لێ نەبوو.

دەستیان بۆ ناموسم درێژکردووە. بۆیە ئەمەیان بەسەرەوە ناروات (بەمحمود) برو کورەکەت بێنەو تەمێ یەکی بکە.

محمود: من کورم نییە.

حەسەن: رێك و رەوان بۆلای نوری دەرۆم.

یەکەیەکە تێ دەگەیەنم. پێی دەڵێم شەرفمیان لە ژێر پێ ناوە. با بینووسی. خەڵکیش با بزانن کە احمد چی ئاڵچاغێکە.

جێگای بەرێوەبردنی «رووناکی» احمد چاکەتەکەی. هەلواسیوە. خەریکی نووسینە. نزیف دێتە ژوورەوە.

نزیف: ئەم کاتەت باش. دووبارە وا تا ئەم درەنگە وەختە کاردەکەی؟

احمد: زۆر درەنگ نییە، هێشتا وەختە.

قەڵەمەکەی دەستی دادەنێ‌و تەماشای نزیف دەکات.

نزیف: خۆ پەکت ناخەم؟

احمد: بەڵێ.

نزیف تەماشای چاکەتە هەڵواسراوەکەی احمد دەکات.

احمد: بپورن (دووبارە دەست بەنووسین دەکاتەوە).

نزیف: بنووسە. تۆ هەقت بەسەرمنەوە نەبێ.

احمد، خەریکی نووسینە. نزیف دەست لەچاکەتەکەی دەدات.

دەمانجەکەی دەدۆزێتەوە. بەئەسپایی لە گیرفانی دەردێنێ.

احمد: (سەری هەڵدەبڕێ): وا دیارە هاتووی شتێکم پێ بڵێی.؟

نزیف: بەڵێ. نامەوێ بێزارت بکەم.. بەڵام..

احمد: فەرموو گوێم لێتە. هەرچیت دەوێ بڵێ.

نزیف: حەسەن هاتەلای نوری‌و دەربارەی تۆو کچەکەی هەندێ شتی پێ گوت.

احمد: چی پێ دەڵێ (بزەدەیگرێ).. دەبێ ئەمە تەواو کەم (دووبارە بزە دەیگرێ).

گەرەکە. چاخانەکەی سەرکۆڵانەکە دیارە. حسن هەمدیس سەرخۆشە. بە لەتر دان لەچاخانەکەوە دێتە دەرەوە.

پانتاییەکی چۆڵی تاریك. لەودیو دیوارێکی روخاوەوە دەستێك. دەمانجەیەکی لە مشتایە درێژ دەکرێت.

دەنگی تەقە. حەسەن دەکەوێت. مردووەو دەمانچەیەکیش لەژوور سەریەوە کەوتووە.

شەوە.ماڵەوەی احمد. دەرگا لێ دەدرێت. فاتمە دەرگاکە دەکاتەوە. احمد دێتە ژوورەوە.

احمد: ببورە دایە. لەبیرم چووبوو کلیلەکە لەگەڵ خۆمدا بەم.

فاتمە: نەخەو تبووم کورم.

احمد: بۆ تا ئێستا نەخەوتووی؟

فاتمە: حەسەن یان گوشتووە. حلیمە لەماڵ نییە.

احمد: چ دەڵێی؟ کێ کوشتی.. بۆ؟ بە دوای حلیمەدا دەرۆم

(دەست لە گیرفانی خۆی دەدا) دەك خوا فەوتان بکات..

فاتمە: ئەوە چی‌یە؟

احمد: دەمانچەکەم بزر بووە وابزانم دەزانم لەکوێ‌یە.

احمد دەردەچێت.

کامیرا، لەدەرەوە دەرگاکە پیشان دەدات. احمد دەرچێتە کۆڵانەکە. دەرگا دەگرێت. چەند هەنگاوێك دەنێت، چوار کەس دەورەی دەدەن.

یەکەم: راوەستە. دەستت بەرزکەرەوە. بیگەرێن.

احمد: چی روویداوە؟ چی‌یە ئەوە؟.

یەکەم: نازانی چ بووە؟

دەنگی عزیز: هەواڵەکانی لاپەرەی یەکەم نوری دەینووسی.

رۆژنامەی «آقشام» ژوورەکەی نوری. نوری هەواڵەکەی دەنووسی. رفیق دێتە ژوورەوە. نوری هەڵدەستێ.

رفیق: تەواو بوو؟

نوري: (ئەوەی نووسیوە بەرفیقی پیشان دەدات) تەواو.

رفیق: (دەیخوێنێتەوە) تاوانێکی گەورە (بەنوری) باشتر وایە بیکەی بە (تاوانێکی...) نوری تێبینی‌یەکەی دەنووسێ.

رفیق: (بەردەوامە لەسەر خوێندنەوە) «ئاشتیخوازان خەریکی تاوان کردنن. سەرەکی ئاشتیخوازان باوکی دوستەکەی خۆی دەکوژێ». نزیف ریپورتاجەکەی خۆی هێنا کە لەم بارەیەوە نووسیبووی؟.

نوري: بەڵێ هێنای.

رفیق: ئەمە یەکەم جارێتی کە شتی باش بنووسێ.

خوا حافیز (دەردەچێت).

نوري بە نووسینەکانی خۆیدا دەچێتەوە.

گولسوم دێتە ژوورەوە. تازەترین مودەی جلی لەبەردایە. شەبقەیەکی بەسەرەوە ناوە. نوری چاوی ماندووی هەڵدەبڕێ. گولسوم زاق زاق تەماشای دەکات.

گولسوم: راستە شتی وا رووی‌داوە؟

نوری: نازانم؟

**گولسوم**: ئایا راست دەکەی کە دەڵێی نازانم؟

**نوری**: (هەڵدەستیو بەدەنگێکی بەرز) بەڵێ. ئەو کوشتی من چی بکەم؟ کوشتیو ئەهـ.

**دەنگی عزیز**: ئەمجارەیان بە ئاشکرا مەحکەمە کرا.

هۆڵی دادگا. احمد لەنێوان دوو جەندرمەدایە.

**سەرۆك**: علی، با بێتە ژوورەوە.

هۆڵەکە خەڵکێکی زوری تیا دانشتوە.

**یەکێ لە دانشتوان**: (بە یەکێکی‌کە) تەماشای ئاشتیخوازان بکە..

**دانشتوانێکی کە**: لە پیاو کوژ ناچێ.

**ئەوەی پێشـوو**: ئەو ئافـرەتـەی کەپـار مێـردەکـەی ژەهراوی کرد ئەویش لە پیاوکوژ نەدەچوو.

علی دێتە ژوورەوە.

**سەرۆك**: (بەعلی) ناوت؟

**علی**: علی توفیق اوغلی. 47 ساڵ، کرێکار.

**سەرۆك**: وا دەردەکەوێ، دادگات گەلێ بینیوە.

**علی**: پێی ناوێ. ئەوەی راستە دەیڵێم.

**سەرۆك**: ئەو رۆژە لە چاخانەبووی؟

**علی**: سەر لە ئێوارەکەی لە چاخانەبووم.

**سەرۆك**: ووتی، کچەکەم دوستی احمدە؟

**علی**: ووتی.

**سەرۆك**: ووتی دەرۆم هەموو شتێك بە نوری دەڵێم؟

**علی**: بەڵێ.

**سەرۆك**: (بەعلی) دەتوانی برۆی. نوری بەگ با بێتە ژوورەوە.

**یەکێ لە دانشتوان**: تێگەیشتی. دۆستی بووە، وادیارە یەکتریان خۆش ویستوە، بەڵام پیرەمێردەکە رازی نەبووە شووی پێ بکات.

**ئەوەی تەنشتی**: ئەگەر کچی تۆ بوایە چیت دەکرد؟

**ئەوی‌تر**: من کچم نییە.

نوری دێتـە ژوورەوە. گولسـوم، لەبـەردەمـەوە دانشتوە. بە دیققـەتـەوە تەمـاشـای نوری دەکـات، نوری کەگـولسوم دەبینێ دەشڵەژێ. لە سوچێکـەوە باوکی گولســوم دەبینێ دانشتـــوە، تەماشای باوکی دەکات.

**سەرۆك**: (بەنوری) وەرە پێشەوە.

نوری نزیك دەبێتەوە.

**سەرۆك**: ناوت، ناوی باوکت، تەمەنت؟

**نوری**: نوری.. محمود، سیو دوو.

**سەرۆك**: ئیشت؟.

**نوری**: رۆژنامە نووس.

**سەرۆك**: سوێند دەخوی لە راستی زیاتر هیچ نەڵێی؟

**نوری**: (چاوی خوار دەکات) سوێند دەخۆم.

نوری جارێکی کە بەتیلەی چاو تەماشای گولسوم و باوکی دەکات.

**سەرۆك**: ئەو ئێوارەیە نزیف پێی ووتی، حسن دێ بۆلات.

**نوری**: بەڵێ.

**سەرۆك**: چی گوت؟

**نوری**: گووتی حسن دێ بۆلات بۆ ئەوەی چەند قسەیەکی هەیە بەتۆی بڵێ.

**سەرۆك**: هەر ئەوەندە.؟

**نوری**: بەڵێ.

**سەرۆك**: بەر لەوەش دەهاتە لات.

**نوری**: (تەماشای گولسوم دەکات) نەخێر.

گولسوم هێز دەداتە خۆی، دەیەوێ شتێك بڵێ بەڵام خۆی دەگرێ.

**مدعی عام**: (بەسەرۆك) رێگەم دەدەی؟

سەرۆك سەری رەزامەندی دەلەقێنێ.

**مدعی عام**: دوو پرسیارم هەیە نوری بەگ، یەکەم (بەسەر هێما بو احمد دەکات) دەمانجەی هەبوو.

**نوری**: هەیبوو.

مدعي عام: هيچ بينيوته تەقە بكات؟
احمد: (بەدانشتنەوە) بەڵێ. تەنها جارێك ئەويش بۆ تاقى‌كردنەوە.
سەرۆك: رێگام بەتۆ نەداوەتا قسە بكەيت.
مدعي: يانى چاك دەزانى چەك بەكار بێنێ.
(بەاحمد) كوا دەمانچەكەت؟.
احمد: (لەسەرخۆ) هەزار جارم پێ ووتن. نازانم يەكێك لە گيرفانى دەرهێناوم.
مدعي: كێ؟.
احمد: ئەمەيان، ئێوە لە من باشتر دەزانن (هەڵدەستىو ئيشارەت بۆ نورى دەكات) ئەم كابرايە دەرهەق من ئەوەى راستى بێ نايڵێ.
دوژمن يەكترين. خايينە. خيانەكەشيم ئاشكرا كردووە.
نوري: جەنابى سەرۆك!..
سەرۆك: (بەاحمد) نابێ هەستى شايەت بريندار بكرێت.
احمد: يەكێ كە ئالجاغ و خائين بوو هەستى بريندار نابێت.
محمود رووى خۆى بەهەردوو لەپى شاردۆتەوەو بێ دەنگ دەگرى.
دەنگى احمد: ئەو دەزانێ كێ حەسەنى كوشتووە..
نوري: جەنابى سەرۆك!.
احمد: ئەو دەزانێ ئەم كەين و بەينە چۆن هونراوەتەوە. ئێوەش دەزانن كە ئەم دادگايە....
سەرۆك: (قسەكە بە احمد دەبرێت) نابێ دژ بە دادگا برۆى. ماوەت نادەم قسەبكەى...
احمد: خۆ پيويستيش ناكات.
قاقا پێدەكەنێ و لە جێگاى خۆى دادەنيشێتەوە.
سەرۆك: (بەنورى) دەتوانى برۆى (بەوەى كە خەڵكى بانگ دەكات) با نزيف بێتە ژوورەوە.
كرێكارێك: (كە بەتەنيشت خديجەوە دانشتووە) ئاى دايكت وا... بەراستى كارێكى ناپەسەندە.
خديجە: ئەى تۆ چۆنى دەزانى...
كرێكارێك: (بە فاتمە كە خەريكە دەگرى) مەگرى دايە. هيچ خاوەن ويژدانێك بروا ناكات احمد كارى وابكات.
نزيف دێتە ژوورەوە.
سەرۆك: ناوت، ئيشت؟
نزيف: ناوم نزيف ە. باوكم خيرالدين، رۆژنامە نووسم. (40) ساڵانم.
سەرۆك: لەگەڵ گومان لێ كراودا ناحەزىتان هەيە؟
نزيف: لەگەڵ احمد بەگدا؟ دەبێ چ ناحەزىيەك لە نێوانماندا هەبێت؟
سەرۆك: (بەاحمد) لەم بارەيەوە تۆ چ دەڵێى؟
احمد: (هەڵدەستێ ووشەكان يەكە يەكە لەدەم دەردەچێ). ئەوەى، دەمانچەكەى، دزيم ئەمەيە.
نزيف: دەمانچەى چى؟ ئەمە چۆن قسەيەكە؟
سەرۆك: دەتوانى بيسەلمێنى؟
احمد: (دادەنيشێتەوە) نەخێر.
نزيف: بوختان دەكات. بەچى مافێكەوە ئەم بوختانە دەداتە پاڵ من؟
سەرۆك: ئارام بگرە.. چى دەزانى ئەوەيان بڵێ.
نزيف: ئەو ئێوارەيە چوومە لاى لە «رووناكى» بەتەنهابوو هەروەها كەمێ پەشۆكابوو.
مدعي: (بەسەرۆك) دەتوانم پرسيارێك بكەم؟
سەرۆك سەرى بۆ دەلەقێنێ.
مدعي: (بەاحمد) گومان لێكراو دەتوانى ئەوەمان بۆ روون بكاتەوە، ئەو ئێوارەيە بۆ شڵەژابوو؟
احمد: ئەو ئێوارەيە هەواڵى ئەوەم بيستبوو، گوايە ميرى دەيەوێ جارێكى كە رێكەوتنێكى جەنگى مۆر كات، ئێمەش تواناى بەرەنگار بوونەوەمان نەبوو، بۆيە منيش تورەو نارەحەت بووم.
سەرۆك: رێگات نادەم قسەبكەى (بەنزيف) بەردەوامبە..
نزيف: بەڵام وەك من بزانم. ئەو لە خۆ دەرچوونەى هويەكى ترى هەبوو.

مدعی: چی بوو؟

نزیف: کەچووم بۆلای‌و پێم گووت حەسەن هەموو شتێکی بە نوری گرتوە تورەبوو، سوور هەڵگەرا.

بەرچاوی تاریك بوو، بەتورەیی‌یەوە.

ووتی «دەبێ ئەم کارە تەواو بکەم»

مدعی: بەڵێ تەواوی کرد..

سەرۆك: (بەاحمد) دەربارەی قسەکانی ئەم شایەتە چ دەڵێی؟

احمد: (بەپێکەنینەوە) بەڵێ.. زۆر چاك لەبیرمە، شتێکی وام گووت. بەڵام بە مەبەستێکی ترەوە...

سەرۆك: ئێمە هەقمان بەسەر ئەوەوە نی‌یە کەچ مەبەستێکت هەبووە (بەنزیف).

دەتوانی برۆی. (بەوەی خەڵکی بانگ دەکات).

بانگی حلیمە بکەن.

احمدو ئەوانەی ناو هۆڵەکە ئاور بۆ ئەو دەرگایە دەدەنەوە کە حلیمەی لێ دێتە ژوورەوە.

حلیمە کە بەلای احمددا تێپەر دەبێت بۆی پێدەکەنێ. احمد بەبزەیەکی گەرم وەرامی دەداتەوە. یەکێ لە دانشتوان بۆ ئەوەی بەباشی حلیمە ببینێ چاویلکەکەی دەکاتە چاو. گولسوم بەرێزەوە تەماشای حلیمە دەکات. حلیمە بەرامبەر سەرۆکی دادگاکە رادەوەستێ..

سەرۆك: ناوت؟ ناوی باوکت؟ تەمەنت؟

حلیمە: (بەربەلای احمدەوە دەکات) دەزانم تۆ نەتکوشتووە.

سەرۆك: وەرامی پرسیارەکەم بدەرەوە.

حلیمە: (بە بزەیەکی غەمگینەوە) رێگام بدەن (بەاحمد) بروات پێ دەکەم.

مدعی: جەنابی سەرۆك!

حلیمە: (بەسەرۆك) وا وەرامی پرسیارەکانتان دەدەمەوە.. ناوم حلیمەیە، باوکم حسن، 20 ساڵانم.

سەرۆك: سوێند دەخۆی هەرچی راستە ئەوە بڵێ؟

حلیمە: من درۆ ناکەم.

مدعی: قەت لەگەڵ باوکتا درۆت نەکرد؟

حلیمە: تەنها جارێك.

مدعی: ئەویش رەنگە پیوەندی بەمەسەلەی دڵداری بوو بێ؟

احمد: (لەشوێن خۆی هەڵدەستێ) دەست مەکێشە کاروباری تایبەتی یەکێکی کەوە.

حلیمە: (چاوی پڕ بووە لە فرمێسك) (بە احمد دەڵێ):

دەتوانم وەرامی هەموو پرسیارەکانیان بدەمەوە.

هیچی‌وا شك نابەم ووتنیان بینە هۆی شەرمەزاریم ئارام بگرە احمد.

احمد دادەنیشێ.

حلیمە: (بەمدعی): لە سەرەتاوە دڵداری‌یەکەم لە باوکم شاردەوە. (بەاحمد) هەرچەنە نەدەبوو وام بکردایە. بەڵام خۆت دەزانی چەندی لێ دەترسام.

سەرۆك: تۆ وەرامی پرسیارەکانی من بدەرەوە.

ئەو ئێوارەیە باوکت چی پێ گووتی.

حلیمە: سێ شتی لە احمد داواکرد. ئەو کاتە هەموو شتێکم لەلا درکاند

سەرۆك: چیت درکاند؟

حلیمە: هەموو شتێکم پێ گووت (فرمیسك بە چاویا دێتە خوارەوە).

مدعی: تێ گەیشتین.. ئەو شتانەی کەووتت چین؟

حلیمە: (بەر بەلای احمدەوە دەکات) پێم گوت..

دەبم بەدایك!...

مدعی: (بە دەنگێکی ناسازەوە)... ها... تۆ تەماشاکە..

احمد: (بۆ یەکەم جار تورە دەبێت).. وسبە..

(بەحلیمە بەهێمنی‌یەوە) ئەمەتیش لێ شاردمەوە؟

حلیمە: ووتم با باوکم رازی بکەم دواجار پێت دەڵێم.

مدعی: ئەمە چی‌یە؟ بۆ ئەوە هاتوون باسی کردەوە ناشرینەکانی خۆتانمان بۆ بکەن..

سەرۆك: (بەحلیمە) مافی ئەوەت نییە تا لەگەڵ گومان لێکراوا قسان بکەی.

**حلیمه:** مافی ئەوەم نییە لەگەڵ باوکی منالەکەمدا شه بکەم. وانییە؟

احمد بە چاوی میهرو خۆشەویستی‌یەوە تەماشای حلیمە دەکات.

**سەرۆك:** تۆ تەنها وەرامی ئەو پرسیارانە بدەرەوە کە من پرسیارت لێ دەکەم. دواجار باوکت چی‌کرد؟

**حلیمه:** لێی‌دام، دوکانەکەی گرت. ووتی دەبێ احمد بکوژم و دەرچووە دەرەوە.

**مدعی:** ووتی دەبێ بیکوژم ها؟

**حلیمه:** بەڵێ.

**مدعی:** بەڵام کار بە پێچەوانەوە رویدا. (بەگاڵتە پێ کردنەوە) لەوانەیە لەترسی گیانی خۆیدا ئەوی

کوشتبێ. کێ چوزانێ؟

**حلیمە:** (بەدەنگی بەرز).. نەخێر.. ئێوە باوکمتان کوشت دەتانەوێ احمد لەکە داریکەن.

**سەرۆك:** (چەکوشەکە بەسەر مێزەکەدا دەدات) بێ دەنگبن..!

**حلیمه:** بڵێن بزانم کێ باوکی کوشتم؟

**دەنگی عزیز:** حوکمی مردنیان بەسەر احمددا. هەر کە لەزیندانیان توندکرد. لەنان خواردن مانی گرت.

ژوورێك لەحەپسخانەدا. احمد راکشاوە، لەپشتێنەی بەرەژوور رووتە. خەریکە خەوی لێ دەکەوێ.

چەند سەموونێك لە ژوور سەریەوەیەتی. دەرگای ژوورەکە دەکرێتەوە. بەرێوەبەری حەپسخانەکەو گاردیانێك دێنە ژوورەوە. سینی‌یەك خواردن بەدەست گاردیانەکەوەیە.

**بەرێوەبەر:** ناخۆی؟

احمد وەرامی ناداتەوە. رووی وەردەگێری بۆلای دیوارەکە.

**بەرێوەبەر:** دەترسێ خواردنەکە ببینی خۆت نەگری؟

احمد وەرامی ناداتەوەو رووی بەولادا وەردچەرخێنێ.

چوار مشقی لێی دادەنیشێ.

بەرێوەبەر بەچەتەڵێك پارچەیە گوشت و هەڵدەگرێو دەینێتە دەمیەوەو زوان بە مەلاشودا دەدا.

**بەرێوەبەر:** ئەمرۆ چەنەم رۆژتە؟

**احمد:** نەمژماردوون.

بەرێوەبەر سەموونەکان دەژمێرێ.

**بەرێوەبەر:** شەش... (حەوتەمینیش فڕێ دەداتە سەر ئەوانی‌کە).

**بەرێوەبەر:** ئەمەش حەوت. بزانین تاچەند بەرگە دەگریت، (بەگاردیان) تۆ برۆ.

گاردیانەکە، سینی‌یەکە دادەنێو دەردەچێ.

**بەرێوەبەر:** بەزەییم پێت دێ. کەمێك گۆشت بخەرە دەمتەوە. کێ دەتبینێ؟

**احمد:** برۆ. دەرچۆ.

**بەرێوەبەر:** مادام وایە باپێت بڵێم. هەڵدە واسرێی ئیتر بۆ ئازاری خۆت دەدەی...

(بەرەو دەرگاکە دەروات و بەدەنگێکی بەرز دەڵی وەرنە ژوورەوە).

نوري دێتە ژوورەوە. بێ دەنگی‌یەك.

**نوري:** منم... نوری.

احمد بێ‌دەنگە.

**نوري:** کوڕت بووە. ناویان ناوە «تاهیر».

احمد بێ دەنگە.

**نوري:** رفیق لەگەڵ سەرۆکی دادگای «استئناف»دا قسەی کردووە، ئەگەر دەست لەم مان گرتنە هەڵگری سەرلەنوێ تەماشای دەعواکەت دەکەن.

نامەوێ درۆت لەگەڵدا بکەم، بەرەڵلات ناکەن، بەڵام حوکمی ئیعدامت لەسەر لادەبەن و دەیکەن بە 10 ساڵ بەند، لەوانەشە فەرمانی بەخشینت بۆ دەرچێ لەدواییدا.

احمد بێ‌دەنگە.

نوري: دەبێ بژێ، لەبەر خۆت نەء، لەبەر کورەکەت. لە پێناوی حلیمەدا. مان گرتن لەنان خواردن چی بەدەستەوە دەدات. . .
احمد بێ دەنگە.

نوري: وا دەزانی تەمێیان کردوم کەوات پێ بڵێم.. نەخێر، خۆم هاتووم. مردن شتێکی ترسێنەرە.

ژیان وا بەدەستی خۆتەوەیە. واز لەمانگرتن. بێنە.
احمد هەڵدەستێ..

نوري چاوەڕێی ئەوەیەتی شتێك بڵێ.
احمد بێ دەنگە.

نوري: (هەردوو قۆڵی دەکاتەوەو هەنگاوێك دەرواتە پێشەوە) ببورە برا بمبورە..
احمد: (دەگەڕێتە دواوە): برۆ لاچۆ. . .

نوری دەستی شۆڕدەبێتەوە. هەنگاو هەنگاو بەرەو دواوە دەروا تا دەردەچێ.

شەوە. ژوورێکی حەپسخانەکە. ژوورەکە تریفەی مانگی تیا راخراوە. احمد راکشاوە دەستی لەژێر سەرناوە. بییردەکاتەوە.

دەنگی عزیز: ئا بەوجۆرە، بۆ تەنها جارێك چی‌یە کورەکەی خۆی نەبینی. . .

. . . . احمد بزە دەیگرێ. منالەکە بە قوماتێکراوی. . دواجار ساوایەك دایکی خەریکە فێری هەنگاونانی دەکات. دیمەنی تاهیر هەندێ کتێبی لەبن باڵدایەو بۆ قوتابخانە دەروات.. ئینجا دیمەنی منالی نوری‌و احمد لە بۆشایی‌یەکدا یاری کۆلارە دەکەن.

احمد رووی خۆی بەدەستی دادەپۆشێ، فرمێسك بە روومەتیا دێتەخوار. خەیاڵەو ڕووژاوەکانی لەبەر چاودا نامێنێ.

مانگ لەناو گەواڵە هەورەکاندا خۆی دەشێرێتەوە.

ئەو گۆرانی‌یەی کە حلیمە لە دارستانەکەدا کاتی خۆی ووتی، دەبیسترێ.

دەنگی عزیز: رۆژێك لە کازیوەدا.

ژووریێ لە حەپسخانەکە. احمد لەبەر پەنجەرەکەدایە. تەماشای دوور دەکات. دونیا هێشتا تاریکە. جیرە لە دەرگاکەوە هەڵدەستێ. احمد ئاوڕ دەداتەوە. بەرێوەبەرو مدعی عام و گاردیان و دوکتور پێکەوە راوەستاون.

احمد: تەواو؟

دوکتور: (لە احمد نزیك دەبێتەوە) من دوکتور دەبێ فەحصت بکەم.

احمد بەگاڵتە پێکردنەوە تەماشای دەکات.

مدعی: ئەمە فەرمانی یاسایە.
احمد: ئێوە تەنها مرۆڤی ساغڵەم هەڵدەواسن؟

تەندروستیم زۆر باشە. تەنها برسیمەو هیچی‌کە (بەبەردەمیا دەروات) با برۆین.

بەرێوەبەر: (قۆڵی دەگرێت) دەبێ ئەم جلەت داکەنی (کراسێکی ئاودامانی دەستی گاردیانەکەی پیشان دەدات).
احمد: ئەمەش هەر فەرمانی یاسایە؟ باوابێ.

گاردیانەکە کراسە ئاودامانەکە دەکاتە بەر احمد، لەگەڵ جەندرمەیەکدا لەدواوە هەردوو مەچەکی دەبەستنەوە. دواجار کاغەزێکی نووسراو بە بەر سنگیا دەکەن.

احمد: چی تیا نووسراوە؟
مدعی: تاوانەکانت.

احمد: دەبوایە بەمل ئێوەدابکرێت، ئێوەو دەست و پێوەندەکانتان. دڵ نیام هەرواش دەبێت. .

احمد دەردەکەنە دەرەوە. سەری بڵند دەکاتەوەو پڕ بە سنگی هەوای ئەو بەرەبەیانە هەڵدەمژێ.

تەمــاشــای گزنگی خۆرە تازە هەڵهــاتــووەکــە دەکـات. بزە دەیگرێ. لەسەرخۆ هەنگاو دەنێ.

لەپڕ لەبەر چاو وون دەبێت.

**دەنگی عزیز:** هەڵیان واسی.

رووەمەتی فاتمە، دەگری.

حلیمە وەك بروسکە لێی بدات، دەکەوێت.

**علي.** لەبەر پەنجەرەیەك راوەستاوە دەگری.

**گەرەك کپ و بێ دەنگە. لەسەر کانی‌یەکە کەس نابینرێ.**

**دانشتوانی چاخانەکە کپ و خامۆشن. . کەس یاری ناکات.**

**چێشتخـانـەکـەی محمـود کەسی لێ‌نییـە. محمـود بەتـەنها دانشتووەو رووی خۆی لە چنگە گرتووە.**

**کارگەکە کرێکارەکانی بێ‌دەنگە راوەستاون**

**دەنگی عزیـز:** ویستیـان احمـد بمـرێت، کەچی وا لەهـەمـوو شوێنێکدا دەژی.

منالّ لاوانی گەرەك وەستاون تەماشای کۆلارەیەك دەکەن.

**منالێك:** کۆلارەکەی مامە احمد.

دوکانی شووتی فرۆشێك.

**شووتی فرۆشـەکـە:** (شـووتی‌یـەك بۆ کریـارێـك درێژ دەکات)

هەزار رەحمەت لەگۆڕت کەس وەکو خۆی شووتی نەدەناسی. .

**دەنگی عزیز:** ناوی کەوتە نێو گۆرانی شایەرەکانیش.

لە گۆڕەپانێکدا. یەکێك ساز لێ‌دەدات. خەڵکێکی زۆری لێ کۆبۆتەوە، بەدەم ساز لێدانەوە گۆرانی‌یەکەی احمد دەڵێت.

وێنەیەکی احمد پیشان دەدرێت، وێنەکە شەپۆل دەدات.

**دەنگی عزیز:** بەڵام ژیان لەرەوتی خۆی ناکەوێت.

وێنەی «تاهیر»ی سێ ساڵان پیشان دەدرێت. .

ڤارگــۆنی نمــرە سێ. «تـاهیـر» بە باوەشی کرێکـارێکی ناو شەمەندەفەرەکەوەیە. دەیتاتە علی، ئەمیش دەیداتە حلیمە.

**علي:** (بەکرێکارەکە) منالّت خۆش دەوێت؟

**کرێکارەکە:** من هەموو کەسێکم خۆش دەوێت.

ویسـتـیــان ببـم بە پۆلیس. دەیــان گووت تۆ خەڵکی باش دارکاری دەکەیت. بەمشتێ گایەك یخ دەدەی.

**کابرایەك:** پەکوو. باشە دواجا.

**کرێکارەکە:** نەمویست ببم بەپۆلیس. ناتوانم ئازاری خەڵکی بدەم.

**کابرای چاو وەردێناوی:** ئاخ خۆزگە من دەبووم.

ئاخ تەنها جارێ سکم تێر دەکرد

**کرێکارەکە:** ئەو کارە بەگوێرەی من نییە.

(هەندێ زەیتوون و پارچە نانێکی دەداتێ) دەبخۆ.

**کابرای چاو وەردێناوی:** پیاوێکی خاسی.

کرێکارەکە دەڕواتە نزیکە دەرگاکەوە.

شەمــەنــدەفــەر لەوێستگـایـەك نزیـك دەبێتـەوە. نوری لە جێگاکەی خۆی دەستی لەسەر دڵی داناوە. راکشاوە.

دەنگی پێچکــەکــان کەم دەبێتـەوە. کرێکـارێکی‌کـە لەبەر دەرگاکە راوەستاوە، پێ‌یەکی لەسەر پەیژەکان.

دانــاوە. باز دەداتــە خوارەوە، بۆ ماوەیــەك لەگــەڵ شەمەندەفەرەکەدا رادەکات.

**کرێکاری یەکەم:** (هاوار دەکات) ئەوە چی بوو؟

کرێکارەکەی کە رادەوەستێ.

**کرێکارەکەی‌کە:** بەداخەوە، چۆن ئەمەی کرد، چی

بەخۆیکرد.

**کرێکاری یەکەم:** چی‌یە؟ چی بووە؟

علی‌و لاوەکەو کابرای چاو وەردێناوی‌یەکە، لە دواوەوەی ڤارگۆنەکەوە دەبینرێن.

**کرێکاری دووەم:** گارسۆنی ڤارگۆنی نان خواردنیان گرت.

**کرێکاری یەکەم:** بۆ؟.

**دووەم:** دەڵێن دوو ئەفسەری بیانی لە شەمەندەفەرەکە فرێ داوەتە خوارێ.

رووی کرێکاری یەکەم لە نزیکەوە پیشان دەدرێت.
لەگەڵ خۆیا قسە دەکات. بەدەستە سڕەکەی دەستی روومەتی دەسرێت.

ڤارگۆنی‌نمرەیەك. بەچوار دەستە لاشەی نوری دەردێنن. گولسوم لە پەنجەرەکەوە تەماشا دەکات.

جەنازەکە بەرە بەرە دوور دەکەوێتەوە.

⋮

گولسوم دەڕواتە سەر جێگاکەی خۆی. برێ پیاوی ماقووڵ و پۆشتە لەبەری هەڵدەستن

**یەکێکیان:** کۆتایی هات.

تەرمەکەی نوری بە تەنیشت ڤارگۆنی نمرە سێ‌دا تێپەر دەکەن.

⋮

**لاوەکە:** تەرمی کابرایەکی نێو ڤارگۆنی نمرە یەکە.

**چاو وەردێناوی‌یەکە:** بەقیرو قەوەیسیا. ئەوەندەی خواردووە چوارپەلی هەڵساوە.

!

کرێکاری یەکەم تەماشای زەوی دەکات. ئاگای لە دەورو بەری خۆی براوە. شەمەندەفەرەکە دەکەوێتە رێ. لە شۆستەکە دوو جەندرمە گارسۆنەکەیان داوەلەبەر. ئەوانەی ناو ڤارگۆنی نمرە سێ تەماشا دەکەن.

**لاوەکە! واهات**

وا گەیشتنە ئاست ڤارگۆنی نمرەی . گارسۆنەکە زنۆقی چووە. تەماشاکەی لەگەڵ تەماشای کرێکاری یەکەمدا یەك دەگرن

**لاوەکە:** سەیرە چۆن ئەم کابرایە لە دەرهەقی دووکەس هات.

**کرێکاری یەکەم:** ئەوانە من لە شەمەندەفەرەکەم فرێ دانە خوارەوە... خوا حافیز.

خۆی فرێ دەداتە سەر شۆسەکە.

**کابرا چاو وەردێناوی‌یەکە:** بزانە ئاگاشمان لێ نەبوو.

کرێکاری یەکەم، پاڵێك بە گارسۆنەکەوە دەنێ‌و دەچێتە نێوان دوو جەندرمەکەوە.

**علی:** (بە برادەرەکانی) ئەمە لەبیرنەکەن.

کرێکاری یەکەم دوو جەندرمە ئەملاو ئەولای گرتووە سەری بەرز کردۆتەوەو تەماشای دوور دەکات.

شەمەندەفەرەکە دوور کەوتۆتەوە. لەدوورەوە لە زنجیرێك دەچێ.

★ ★ ★

ئاشتیخوازانی دونیا کۆبوونەتەوە.

**سەرۆکی ئاشتیخوازان:** ئەو مەدالیایەی کە بریار دراوە بە احمد بدرێ، ئێستا بە خێزانەکەی دەدرێت

حلیمە، احمد بە باوەشەوە دەگرێ دەروا مەدالیاکە وەربگرێ.

هۆڵەکە هەمووی راستەبێ هەڵدەستێ‌و دەبێتە چەپڵە رێزان.

حلیمە دەگری. تاهیر فرمێسکی دایکی دەسرێ‌و پێدەکەنێ.

# هەڤبەركرنا چەند پەیڤان

## كامیران بەرواری

زمانێ كوردی دارەكا پڕ چەق و تایە.. دەولەمەند و پڕ بهایە.. گەلەك جاران هنەك پەیڤ برامانەكێ یان ڕامانەكا نێزیك و هەڤگۆر دئێنە بەرچاڤێن خاندەڤانی وەك: جوان = خشكۆك = تازە = سپەهی = ڕند = قەشەنگ = دەلال.

لێ د دەلیـڤـەكـێ دیدا دبینین ئاخڤتن هەنـە ئێـك ڕۆخسارن لێ ناڤەرۆك و مەرەم ژێ ژێك خۆیایە ئانژی ب نیشانا «7» لسەر یان لبن پیتێ ژێك دئێنە جوداكرن..

ژ بـەر گرنگیـا زمـانی پێـدڤیـیە ئەم ڤان ڕەنگـە پەیڤـان برەنگـەكێ دیـارو باش دەست نیشـان كەین د خەبـەرنامێن كوردیدا چاپێن بهێن..

ئەڤە چەند وێنەكن ژ وانان:

بەر: بەرێ پەرۆكی «قوماشی»، بەرێ مەخەویرێ.. ژن دبێژن:

«ئەڤ كراسە یێ سێ بەرە» ع: عرض.

بەر: كورد دبێژن «هەر بەرەك ل جهێ خوە یێ ب قەدرە»[1] ع: حجر

بەر: ئەڤ ساڵە بەرێ دارو باری گەلەكێ باشە ع: ثمار، انتاج

بەڕ: مەحـڤـویـرە.. مللەتـێ كورد ناڤـدارە ب بەڕو مەحفویرێن فولكوری ع: سجاد

بار: وەك بارێ هەلزێ، بارێ دارا ع: حمل

بار: بارا كەوا ئانـژی دبێـژنێ ڕاڤـە كەو، ب زۆری ل زڤستانێن كوردستانێ ئەڤ كارە هەیە ع: سرب

بار: هەڤـالینـۆ دڤی بارو دۆخیـدا دەستێ هەڤ بگـرن و گۆڤەندا مە ب ڕەوش بێخن ع: ظرف، حالة

بەتەن: كورد دبێژنە رویێ لحیفێ یێ ژناڤدا «بەتەن».

بەتـەن: قەدپـالا چیـایـە، تەنشتا چیـایـە بەری ببیتە ئەڤدازیەكێ ڕك ع: سفح الجبل

بەتەن: گوشتێ لسەر پراسیێن مروڤی و گیاندارانە.

پیر: مرۆڤێ سەرە و ب ناڤسالڤە چویە ع: معمر، مسن

پیر: ناڤێ تەخەكا ئێزدیانە «زەرەدەشتیا كەڤن».

پڕ: زۆر: گەلەك: شرینا من تو پڕ جوانی.. تو پڕ هێژای.

پڕ: تژی: مشـت: لێـڤ و لێـڤ.. پـەرداغ یێ پڕی ئاڤە... ئەو چال یا پڕی ئاخ كری ع: مملوء، ملان

تیر: خەست. ئەڤ ئاڤخوێ یە گەلەكا تیرە ع: كثیف، مركز

تیر: ئێلە، هۆزە، عەشیرەتە.. كورد ئێل ئێل و ژێك بەلاڤن

تیر: تیر دگەل كڤانێ هاتیە ب كارئینان ژ كەڤندا بو ڕاڤ و نێچیرو كوشتنێ د كوردەوارییدا ع: سهم

تیژ: ئەڤ فلفلە تیژە ع: حاد الطعم

تیژ: سەرێ ڤێ شویژنێ زۆرێ تیژە ع: مدبب

تیژ: وەسا تیژ و دژوار هات و تە دگوت سارۆخە ع: سریع

چرویـك: هەی مالاتـە چەنـدێ چرویكی خو فلسـەك ژ دەستێت تە دەرناكەڤیت.

چرویك: دبێژنە وێ گوللا تڤەنگێ ئەوا نە تەقت.

خال: برایێ دایێیە.. كورد د بێژن «خالا خارزا ڕاكرن ماما برازا بن ئاخ كرن ع: خال

خال: نوقتەیە. ل چاخێ نڤیسینێ ئەم ب كار دئینین. ع: نقطة

خال: نیشانە.. وەی! چەندا جوانە ئەو خالا لسەر دێمێ بەفرین. ع: شامة

خال خال: پنی پنی بون و ڕاڤ بۆنا پیستیە

خڕ: گرۆڤڕ: بازنی.. ئەڤ زەڤیا لسەر دژین خڕە ع: مستدیر

خڕ: گیایەكێ بهاریە ل كوردستانێ شین دبە، بنكێ ڤی گیای دخون.

خڕ: هەمی، خڕ پكڤە ل ئاهەنگێ بەرهەڤ ببون ع: كل، جمیع

خر: کوم، هوین ڕابن هێزێن خوه هەمیان خرڤەکەن . . .
هێشتا ئەم هەمی خر نەبووین دەما وان لمە هلێخستی .

دژوار: وەی بابۆ ئەڤ توتنە چەندا دژوارە ع: حاد الطعم

دژوار: دیسـان ب کاردئێت بو دەرمـانـاو ئێش و سۆتنا وان وەکی دڤێ سترانا فولکلوریدا خوەیا دبیت:

ئەزێ بریندارم     ئەزێ بریندارم
چولیێ لاو     ئەزێ بریندارم
بێژنە حەکیما     دەرمان دژوارن
بێژنە لوقمانا     دەرمانا خارن[2]

دێم: هشکاتی‌یە . . ئەردێ نە هاتیە ئاڤدانێ ع: بور

دێم: سەرو چاڤن، ڕۆخسارە، رویمەتە . . بو جوانیا کچا کورد دبێژن: «وەسان سۆرو سپی‌یە، دێمێ‌وێ وەکی بەفرا ئێك شەڤی‌یە».

دێم: . . هەروەکی هوزانڤانەکێ کورد دبێژیت:
تا بمینێ نوری چاو و هێزی پێم
دێم و دێم و دێم و دێم و دێم دێم

دەم: کاتە، وەختە، چاخە . . . چ دەم تو بێ‌ی ئەزێ بەرهەڤم.

دەم: دەڤـە د کرمـانجیـا خوارێـدا ع: فم دیسان پەیڤا دەم دەمی ژی هەیە ب کارتێ بو کەسێن زوی ژ ئاخفتنا خوە وەرگەڕن یان زوی بریارێن خوە گهۆڕیت «تو مرۆڤەکێ دەم دەمی چ جار مرۆڤ نکاریت پشتا خوە ب تە ڕاست کەتن».

دان: قویتـە . . دان گەلـەك ڕەنگن وەکی : سـاڤـاری، برنجی، دانهێرکی‌و دانقوتی ع: قوت

دان: ئەم وەسـات راهـاتینـە ڕۆژێ سێ دانـان بخـوین تێشت، فراڤین ،شیڤ ع: وجبة

دان: ددان . . ئەڤ پەیڤـە ب ڕەنگێ (دان) د کرمـانجیـا خوارێدا ب کار دئێت. ع: اسنان

دان: گەلـۆ هون دزانن ماف ناهێنـە دان بەلکـۆ د ئێنـە ستاندن. ع: منح، اعطاء

دێر: ڕێز . . مە شین و شادی دێر دێر خاندی‌یە ع: سطر

دێر: جهێ پەرستنا خودێ‌یە د ئۆلێ فەلەیی‌دا ع: کنیسة

سەر: دژی دویماهیێ‌یە . . ئەی نەڤرۆزا من ئەی جەژن و سەر سالا من ع: بداية

سەر: کوردان گۆتیە «سەرێ نە ئێشیت هەوجەی دەرسۆکێ نینە»[3] ع: رأس

سەر: بەراهی‌و پێشـەواو ڕێبـەرێ مللەتـەکی‌یـە، لێ زۆر جاران پاشگـرێ «وك» د چیتە سەرو دبیتـە (سـەرۆك) . . کورد دبـێژ ن: «فـلان ئێـل خودان سەرە» ئانکـو خۆدان بەراهیەکا زانایە. ع: رئيس

سل: تورە، عاجز . . . «هەڤالا من قەت سل نەبە چ لسەر مەنەما مە بوتە نەکری».

سل: ناڤێ ئێشـەك گرانـە، د کوردەوارێـدا دگۆتێ «ئێشا زراڤ» . ئەڤ پەیڤە ژ زمانێن بیانی هاتیە دناڤ کوردیێ‌دا.

شیر: چەکەك کوشتنێ‌یە ناڤدارە ع: سيف

شیر: زۆر باشە زارۆ شیرێ دیا خوە بخوت ع: حليب

شیڤ: خارنا دانێ شەڤێ‌یە ع: طعام العشاء

شیڤ: دولەکا ب ئاڤە کویرو ب داروبارە، ل دەڤەرێن چیا مشەنە ع: وادي

قەر: دەینە . . زۆر جاران ژن چەند نانەکا یان مستەکێن ئاری ب قەر ژ مالێن جیرانا . . دیسا بو پارەو هەمی تشتا دبیتن، لێ یا زانـایـە د ڤێتن قەردار هنـدی وی تشتی ب زڤرینیتەڤە یێ قەر کری . .

قەر: دبێـژنـە بەرانێ ڕەنگێ وی ب سەر ڕەشی‌ڤـە . . . نە دویرە ژ قەرا تورکی هاتبێ کو ڕامان ژێ ڕەشە.

کار: شولـە . . ئەز دبێـژم تەخـا کارکەران جهێ سەربلندیا مەنە . . کوردا گوتیە: «کارێ ئەڤرۆ نە هێلە بو سوباهی»[4] ع: عمل

کار: ئەو جهەیێ خوی‌یێ لێ بەرهەڤ دکەین. ع: ملحة

کار: ئەم دکـارن خوە لبـەر تارستـانـا بگرین، ژ «کارین» ئانکـو «شیـان» هاتی‌یـە . . (وەلاتێ من یێ نەکـارت تە بپارێزیتن دی سەر شۆڕو بن دەست مریتن).

کار: ئامانەکە بۆ هلگرتنا دەخل و دان و ئاری ژ دەبێن داری یان تەنەکا درست دکەن گروڤرە وەك بەرمیلێ . .

کا: ئالاڤێ پرسیارێ یە وەکی دبێژن: کا ئەو ئومێدو چ لێ هاتن؟

کا: ئالفێ پەزو گیاندارانە ژ گیای یان قەسەلێ دئێتە درست کرن ع: تبن

کال: ئەو پەزن یێن گوهێن وان سۆرڤە.

کال: پیرە وەکی لڤێ دەڤێ دیارە:

من پیرەمێر نەڤێت و

من کالێ پیر نەڤێت و

هەکو ژ مزگەتێ تێت و

نەشێت برێڤە بێت و[5]

کن: ب کارتێ بو کچا جوان و رێك و وپێك و هەست سڤك «تویا کنی ،تو ئومێدا ژینا منی».

کن: کورت. . پەروین یا کنە، نا گەهیتە ملێ نازدارێ ع: قصیر

کن: نك . . ئەڤ پەیڤە پتر د شێوێ سورانیدا ل کارە وەکی بێژن: «ئازاد لە کن ئاشتی دائەنیشێ». : قرب

کورت: کوردا «درێژ نەکە کورت و کرمانج ڤەبرە» ع: مختصر

کورت: نازك یا کورتە نا گەهیت ملێ بەفرینێ ع: قصیر

کول: یان کێش: کاش پێکهاتییە ژ چەند پارچە دارەکاو گیاو چولیو هەلزێ لسەر دادنن ژ چیایێن بەفرین د خشینن بێ زەحمەت د ئێتن بو ئەردێ راست لسەر بەفرێ.

کول: گوڤا پەز و گیاندارانە. ع: اسطبل

کول: خاس: روت: رویس، ئەڤـرۆ ئەم یێن بەنـدەوار کرین سەر کۆل و پێخاس تەرا بەرا کرینە .ع: مفد

کول: دبێژنە جهێ برینـدارو دایەڤ بن کول، ئانژی بو کول و کوڤانان لکارە ع: ملتهب

کەر: [ب کتا سڤك] ئانکو پارچە: لەت: قەد: پرت. . .

هەڤال ڤێ ئاخێ چار کەر نەکە یا بێ توخیبە . . .مە ئەوسێڤ دوو کەر کر ع: قطعة

کەر: گوهدرێژە. ع: حمار

کەر: دبێژنە وی کەسی یێ چ نە بهیزیت ع: اطرش، اصم

کویر: کور: قول . .ئەڤ گەرە زۆرا کویرە ع: عمیق

گر: جهەکێ بلندە ع: تل

گر: زەلام باش و ب کەلەخ چاخێ دبێـژن: شێـرکـۆ زەلامەکێ گرە ع: ضخم الجثة

گر: خوریان و نەرەحەتیا پیستێ لەشییە ع: حكة

گر: زڤر. . ئەڤ پاتە یێ ع: خشن

گرگـر: دەنگێ عەورانـە نەخـاسمـە ل بهـاران دەما ئاڤێن بارانێ دبارن، دیسا بو گرگرا دستاری ب کار تێ. .

گرگرە: مەزن و کەنکەنە وەك کەدخۆرو ئاغاو بەگان ئەوێن خوینا مللەتان دمێژن.

گەر: شتی گەرا ساڤاری و برنجی.

گەر: ئەگەر. . هەڤالینۆ گەر وە سەرفەرازی دڤێت خوە ب وەستینن تورێ جیهانێ ب خوینن.

گەر: دور: گەهـ . .گەرا کانیێ یا منە، گەرا ئاشی یا منە ع: دورە نوبة

گەر: خابویرێ مە ب گەرێن کویر ناڤدارە

هەو: هێـرش . .گـەلـەك جاران ل دەمێ شەرێ دبێـژن: هەوە بابۆ هەوە هەوا کورێن مێرانە، هەوا دبەنە سەر چەرێن دوژمنان ع: غارة، هجمة

هەو: هند . . .ئەز هەو دشێم ئانکو ئەز هند دشێم. .

○

پەراوێزو ژێدەر:

(1) گوتنا پێشیانە

(2) سترانەکا فلکورییە

(3) گوتنا پێشیانە.

(4) گوتنا پێشیانە

(5) هوزانا ئاسیا نەبی خدرانە «ئاسیا بەرواری»



# هەیرانوك

ادریس سلیمان سواری

دل و شکێرەوا
تەمالا بابێ خو نەخراب و
ئەو سەرێ خو بلندو
چ بکەم سالا بەرفێ سالێ
دلێ خوَ من گوت هەزازەوا
هویەمان هویەمان دلو شکێرەوا
ئەو سەرێ خو بلندو
سالا بەرفێ سالێ
کول و گازندێن دنیایێ براب خودێ چبکەن
سالا بەرفێ سالێ، سەر دلێ تەوو
هویەمان هویەمان شکێرەوا
دێ رابن گەلی هەڤالا کارێ خوبکەن
رێکا شکێرێ مال خراب چێبکەت
تڤلێن زەویتینی بکولن، هیچکێن مامەش ئاخێ لێبکەن
عەلیو برا رەڤەندێ مێکەوێ بوهارێ دەشتێ دزڤریت ئەم
دێ پێشیا وا راکن مەنەك و بارنێ خوەێ بکەن
هویەمان هویەمان دل و شکێرەوا
ئەو سەرێ شکێرێ مال خراب وابدارە

بنێ شکێرێ مال خراب بەردا وارە
کوچەرێ مال خراب بارکر ،چونە کەڤنە وارە
ئەو جانیکا لاوێ من ناچیتن بەربارە
هەکە وەزێ بچم هارێ، خەلك دبێژن یارە
هەکە براو نەچمە هارێ، توبخو دزانی هەمی سەر دلێ
من دبن قارە
هویەمان هویەمان هویەمان دلا شکێرەوا
ئەو سەرێ شکێرێ مال خراب دبێژن بیەرە
ئەو بنێ شکێرێ مال خراب وا بیەرە
رەڤەندێ مێکەوێ بوهارێ دەشتێ برا
وەفتێ سەر ئەڤرازێ بەرێ خوبدەنێ
خودێ پێشیا رەڤەندی من گوت چاوا
ئێکا بەژن بلندە یا دفنێ خزیمەکا زەرە
گەلی هەڤالا رێکا من بەردەن
نێ هوین زانن دێ چمە تەوافا سینگان و بەرا
جوتێ مەمکا ب خودێ چەوا
من گوت خەم و خەیالێت من
کورێ چاردە سالی وەزێ سەر دلێ خو بکەم دەرە
هویەمان هویەمان هویەمان دل و شکێرەوا

# بەسەرهاتوو بەیتی زلفی و سلێمان

جلال ملا حسن خوشناو

...ـەوەو دەڵێن لە گونـدی (پیرەزا) دوو برا دەبن یەکیان ...کر ئاغا)و ئەویتریان ناوی (مەدۆك) دەبێ . . .
... ئاغـا لە ناوچـەی حەریـر بەنێـوبـانـگ بوو، مەدۆك ...ـەکەی (خۆخێ)و دوو کوڕی لە پاش بەجێ دەمێنین ...فی و سلێمـان) بوو. باوەکـر ئاغـا هەر وەکو نەریتی ... براژنـەکـەی (خۆخێ) مارە دەکات، بەڵام زلفی و سلێمـان بەم کارە رازی نابن و لە ناو خۆڕیك دەکەون و تەکبیر دەکـەن کە خێـڵ بەرەو کوێستـان کەوتـە رێ تۆڵـەی خۆیان لە مامیان بستێنەوە، چونکە باوەکر ئاغا نەك هەر دایکیان مارەکرد بەڵکـو دەستی بەسـەر هەموو زەوی و سامانی باوکیان داگرت، بۆیـە لە کاتی کۆچ کردنی خێـڵ بۆ کوێستان زلفی و سلێمان لە پشت (روانـدوز) لە خێـڵ جیـا دەبنەوەو بۆ پیرەزا دەگەڕێنەوە، بەدەم گەڕانـەوە لەشکـرێـك لە هەواڵ و برادەرەکـانیـان رێـك دەخـەن تا دەگـەنە گوندی (سێناوە)، لە وێندەرێ (مامە سێن) دێتـە پێشیـان بۆ ئەوەی لەم شەرە پەشیمـانیـان بکـاتـەوە بەڵام هەوڵ دانەکەی مامە سێن بێ ئەنجام و بێ سوود بوو هەر وەکو لە بەیتـەکـەدا رۆن ودیـارە، لەشکر لە سێناوەتێ دەپەرێ بەرەو پیـرەزا ئەروا لە رێگـادا لایـان دایـە گونـدی (ئـامـۆکـان) لە وێنـدەریش چەنـد لاوێـك بەگـەڵیـان کەوتن، کاتێك لەشکر دەگاتە «ناو شیوان» ئیسترێکی گەڕو کوێرو پیریان لە گاران گل دایەوە لەگەڵ خۆیان بردیان بۆ پیرەزاو لە نزیك دیوەخانی باوەکر ئاغایان بەستەوە.

خەڵکی گونـد کە ئەم لەشکـرەیـان دیت ئاگـاداری باوەکـر ئاغـایـان کرد، ئەویش زانـی کە مەبەستیـان تۆڵـەو شەرە، فەرمـانی دا تاکـو دیوەخانە ئامادە بکەن تا «ووسوە سۆر»ی فریا بکەوێت، کە ئەو ڕۆژە ووسوە سۆر لەکن دەزگیرانەکەی بوە لە گوندی «خرێ».

ووسـو ئاغـا دەست بەجێ فریـای باوەکـر ئاغـا ئەکـەوێ و دەگـەڕێتـەوە پیـرەزارو بەرەو دیوەخانە دەچێت و لەوێندەری کە ئیسترە قۆڕەکە دەبینێ تووڕە دەبێت و دەزانێت کەوا هەتکیان بە باوەکـر ئاغـا کردووە و یەك دوو «تـەزبی» لە ئیستـرەکـە دەدات و دەڵێ ئەم ئیسترەمان ناوێ.

یەکێـك لە هەواڵـەکـانی زلفی و سلێمـان کە ناوی (حاجی شەمێران) بوو خۆی ئامادە کردبو، تفەنگێکی ڕەشکە لە ووسو ئاغـا ئاگـرداو کوشتی، کە باوەکـر ئاغـا ئەمـەی زانی هاتە سەر لاشەی ووسو ئاغاو چەند بەیتێکی بێ هەر دەڵێ و ئیدی باوەکر

ئاغـا کردیـە شەرە خەنجـەر یەکـەم کەس کە تووشی بوو ناوی (ناسری قەلەندەر) بوو، بەیەك خەنجەر کوشتی .

پاش کوشتنی ناســری قەلــەنـدەر شەر گەرم بوو لە نێـوان لەشکری زلفی و سلێمان و باوەکر ئاغا پیاوەکانی تاکو زۆربەیان کوژ ران و لە ئەنجاما باوەکر ئاغا و زلفی و سلێمانیش کوژ ران و خەڵکی گونــدەکــە بە سەر ناوچــەکـەدا پەرت و بلاو بوون و گوندی پیرەزا بوو بە کەلاوە، تاکو ئێستا کەلاوەی ئەم گوندە هەر ماوە لە نزیك گوندی (خرێ) .

**دەقی بەیتی زلفی و سلێمان .**

**زلفی و سلێمان ئەرێن :**

**باوەکر ئاغا تو وا مەکە**
**تو (خۆ خۆکێ) مارە مەکە**
**مندار رووتن هێتیم مەکە**
**مولکێ بابین «قورە بەگە»**

★ ★ ★

**سلێمان ئەرێ زلفی یە**
**وەتی بابێمە مردی یە**
**دایکامەی مارە کردی یە**
**قەدرن لە ناو «سورچیان» نی یە**

★ ★ ★

**زلفی ئەری سلێمانە**
**بەس دەزگم بکوتە تانە**
**باخێڵ بروا بۆ کوێستانە**
**ئەبمە شانە لە گوندانە**
**ئاوا دەکەم دەغل و دانە**
**لۆ دەستینم «پیرەزانە»**

★ ★ ★

**هەندێ درم دەگز گزێ**
**لەشکر گەیشتە رواندزی**
**زلفی سواری «گوێ مامزێ»**

★ ★ ★

**لەشکر گەیشتە «سێناوێ»**
**(مامە سێن) هاتە بەرایێ**
**لێ دەکا تکاو رەجایێ**
**میران مەچو ئەوێ جارێ**

★ ★ ★

**لەشکر گەیشتە «ئامۆکە»**
**وەگەر کەتن پیاوێ کۆکە**
**ئەمەش رەفیقین ئەورۆکە**

★ ★ ★

**لەشکر گەییە «ناو شێوانێ»**
**هێستریان گرت لە گارانێ**
**هینایان لۆ بن مارانێ**

★ ★ ★

**لەشکر گەیشتە «بەربیا»**
**وەگەر کەتن ریش سپیا**
**هاتن هەتا «گر کەندیا»**
**ووسو دێ لەکن دەزگیرێ**
**لەکەس ناکا چ فکرێ**
**لا ئەدا لۆ کن هێسترێ**

★ ★ ★

**ووسو اغای «خرەمانێ»**
**شیر لە نێکا کەتبوە لانێ**
**بکوژن لاوێ «پەری خانێ»**

★ ★ ★

**هێستر پیرەو کەلکی نی یە**
**لە ئەستوی دان دوو (تەزبی)یە**
**هێستر لەوێندەر کەتی یە**

★ ★ ★

باوەکر ئاغا هەرستایە
عەبای لە ملان فرەدایە
ووسواغا مارم خرایە
کێ ئەو تفەنگەی لەتو دایە؟
★ ★ ★

ڕوی ڕەش بن «حاجی شەمێرە»
تفەنگی داگرت بەفێرە
دای لە سینگو لە بەرچێرە
★ ★ ★
باوەکراغا هاتە دەرە
ئەو خەنجەرەی بە «جەوهەرە»
گەییە «ناسری قەلەندەرە»
لێی دابوو لە توقێ سەرە
دەژێر چەنێی کردە دەرە
★ ★ ★
باوەکراغام مەرە مۆزە
لەبن دەرگەی گالتەو تۆزە
شەرە لە سەر هێسترا بۆزە
★ ★ ★
باوەکراغاو مام «لەشکری»
یەکدیان دا بەر ئاسنگری
یەك بەخەنجەران نامری
★ ★ ★
بەهارە سەرێ هاوینێ
باوەکراغا لە دوینێ
زلفی شەهێی سەر هێلینێ
★ ★ ★
باوەکراغام فەرخێ شێری
چوکی داینە لە پێش میری
داوا دەکا «لێرە میری»
★ ★ ★

باوەکراغام هەرستایە
عەبای لە ملان فرەدایە
داوا دەکا پیرەزایە
★ ★ ★

## تێبینی

ئەم چیرۆکەم لەگەڵ بەیتەکەیدا لەزاری (احمد گولستان) وەرم گرتـوە، ناوبراوله گونـدی (قـەندیل) جێ‌نشینە تەمەنی 95 ساڵە، وەکـاك (زلفی شێـخ مصطفی) کە لەبنـە ماڵـەی زلفی و سلێمـانـەو ئێستــاکـەی لە هەولێـر دانیشتـووە یارمـەتی دام بۆتۆمـار کردنی ئەم بەسەرهاتە لە گوندی (قەندیل).

## فەرهەنگۆك

1 ـ (سێنـاوە، ئامـۆکـا، ناوشێـوان، خرە، قورەبـەگ، بەربیـا، لێرەمیر) گوندن سەر بەناوچەی (حەریر)
2 ـ گرکەند: گردێکە لە نزیك گوندی (بەربیا)
3 ـ تەزبی: تەسبیح
4 ـ ووسو ئاغا: خزمی هەرەنزیکی باوەکراغا بووە.
5 ـ پەری خان: دەزگیرانی ووسو ئاغا بووە خەڵکی (خرە) بوو.
6 ـ هێلین: هێلانە
7 ـ شەهی: شاهین
8 ـ دوین: گوندێکی مێژوویە لە دامێنی ڕۆژ ئاوای چیای پیرمەم.
9 ـ خرەمانێ: گوندی (خرە)یە
10 ـ حاجی شەمێران: لە لایەنگیرەکانی لەشکری زلفی و سلێمان بوو.
11 ـ بەرچێر: بەرۆك
12 ـ مەرە مۆزە: تورەو توند.

# حەمەکور «حەمکێ توڤی»
# ستران بێژێ میر قوباد بەگی

● ریکیش ئامێدی ●

ئەگەر ئەم بهێین بلەز و بەز سەحکەینە تورێ کوردی دێ بینین کو ئەڤ تورە دو توخمن:

1 - تورێ کلاسیکی.

2 - تورێ رۆمـانتی: دیسـا ئەڤ رەنگێ تورەی ژی دبیتـە دوو توخم ئانکو دوو رەنگێ ئەو ژی ئەڤەنە.

أ - ستران ب - داستان

دیارە ژی کو سترانا گەلەك رەنگێت ڤەگرتین وەکی:

1 - گورانی

2 - لاڤژە

3 - زێمار

4 - دیرۆك

5 - نارینك

6 - سەرێ زاڤای

7 - سترانێت دورینێ

8 - سترانێت دبەر مەشکێرا

9 - سترانێت شەرا

10 - سترانێت شەڤەرۆکا.. هتد.

بێگومان ژی هوزانێت سترانا نەهاتینە بەلاڤکرن بێی کو چ سەلیقە (لحن) نە دانابنە سەر.

گەلەك تورەڤان ژمێرو ژنالا بێت نەخوینەڤان یێ ژناف کوردا رابوین مینا:[1]

1 - حەمەکورێ سەلیقڤانێ بادینی

2 - هەرە گولێ بوتانی

3 - زێرویێ هەکاری

ئو ژبلی ڤان ژی گەلەك و گەلەکێت دی خزمەتا ستران و فلکورێ کوردی یێ کری دڤێرەدا مە دڤێت ئەم تیروژگەکا ژتەمەت وێ تیروژکا ژکونا دەرزیکێرا دەردکەڤیت بدەینە سەر ژینـا ئێکی ژڤێهـرس و بێ بەڤلێ دەمێ خو دتـورێ رومـانتیـا کوردیدا ئەو ژی سـترانبێـژێ میـر قوباد بەگێ یە میرێ بادینا دەنگ خوشێ مەزن (حەمە کورە) ناڤێ وی یێ دروست (محەمەد) بو. بەس[2] بناڤی (حەمەکور) ئادهاتە نیاسین.

ئانکو (حەمکێ توڤی) چونکە خەلکێ گوندێ توڤی بو هەر پچویکاتیا خودا بێ کورە بو ئو مروڤەکێ نەخویندەوابو.

حەمەکور ئێك بو ژهوزنڤانیت رۆمانتی یێت کەنکەنە. بهزر و بیرێت خوڤە گەلەکێ بەر فرەهـ بو یێ بیر تیژ بو ئو هنگی بێژی هندێ دل تەر و دەڤ کەنیبو دلێ وی وەکی «کانی رەشێ»[3] هەمی دمێت سالی هەرێ بزان و بوش بو سـترانێت تەر و نازك ژێ دزان ئەوا سـترانـا هەمی رەخ و رێیت ژیـانـا ئەڤیندارا دگـرتن هنـدی ئەو شیـابـا خو دکرە حەکیم و نوژدار بو کول و برینێت بەردلکان ژلاو و زەریا خو دکرە هەدار و خوشی بو وا خورت پەریا یێت کو دکەفتنە بەر هورەبـایێت ئەڤینێ براستی هنـدیکـو مروڤ. بجـوانیو

تازەیی سترانێت حەمکێ بدەتە نیاسین هێشتا سپەهی و بیهاتـرن ژ بەر کو هەچی گول سترانێت وی ببیت دڤێت هەر گوهێ خو بدەتێ بێ راوەستان ئو گروڤا ڤێ چەندێ:

میرێ بەهدینا (قوباد بەگ)ێ[4] کورێ سولتان حوسەینێ وەلی ئەوێ کو سالا 1576ز میراتی لبەهدینا کری پشتی مرنا بابێ خو ئو پایتەختێ وی باژێرێ ئامێدیێ بو.

حەمەکور ئێک بو ژ هەڤگورێت وی ئو هەلبەت سترانبێژێ دیوانا میریبو میر وەسا پێڤە مژیل بو هایژ دادگەریێ نەما. گوهێ وی مابو ل حەمکێ وەکی شەڤەروکا هەتا سپێدێ بو ستران دگوتن.

حەمەکوری گەلەك هوزانێت رۆمانتی یێت هەین هەمی ژی یێت بوینە ستران بۆ نمونە ئەڤە هندەك ژوانە: -

1 - سینەم[5]

2 - حەمك

3 - شاهیناغا

4 - کانیا مالا

5 - ئەز چومە کەلێ

6 - بلبلۆ

7 - وەروەرۆك

براستی حەمەکور یێ هەژیە کو دانین سەرکێشێ تورێ رومانتیێ کوردی.[6]

ئو هەر وەکو سەیدایێ نەمر (أنور مائی) دبێژیت ئەگەر هات و حەمەکور کورد نەبا یێ مللەتەکێ دیبا دا گەلەك پیتەی پێکەن دا دیف رەه و ریشالێت وی چن هەمی تشتا سەر دیارکەن و دا بو پەیکەرا چێکەن ل یانێت تورەیێ و لخاندنگەهێت بەرز و بلند. بەلێ ئەز دبێژم سەد موخابن کو هەتا نوکە بەرهەمێ وی یێ سترانا نە خرڤەبویەو یێ بەرزەیەو شینەوارێت وی یێت دماین ددلێ پیرەمێرو پیرەژنادا ئو ئەڤ گونەهباریە یا هەر کەسەکی‌یە کو خو دانیت ئێکە ژ رووەشەنبیرێت کوردا.

چەوا حەمکێ نەمر جهێ خو لنك خوندکارێ ئامێدیێ کر؟

دەنگێ خوشی و حەنەك زەنی و جامێریا حەمکێ نەمر حەمك لنك خوندکاری شرینکر بو ئێك ژهەڤگورێت خەم رەڤاندێ.

بەلێ خوندکار یێ ژێ پشت راست نەبویە برێڤە چیروکا دەنگێ خوشیا خو بو گوت دیف خەونا دیتی کو کون مێریەکێ دەگەریا ویدا هەلدابو.

ئەو گوتن نەچوو دمەژیێ ویدا ئەگەر باوەریا وی هات کو مروڤەکێ دل روهنە هەما بو تێت هشاریەکا نەیەن لنك هەیە بەلێ یا ئێمنا هیا دلێ وی پێهات ئەو چەوا بو لکاملانا بهارا ئامێدیێ لسەر دەرگەهی شاقولیا غای.[8]

خوندکاری لسەر کورسیکێ هزرا وی لواریێ خوش و هەلێخستی ژهەر چار لاڤە دکر دوربین دچاڤا زێرەڤانیا کابانیا خو دکر کانێ دێ کەنگی ژکانیا خاتینێ[9] لسەر شویا ژنێت خوندکارێت ئامێدێ دەرکەڤیت دا کو ئەو بدوربینێ تەماشە بکەت هەتا کو ببەروار تێت بسەر کەلا ئامێدیێ ڤە دکەڤیت دەمێ سالێ پاش بیستی (20) نیسانێ‌یە کاملانا بهارێ‌یە.

بهارا سبەهـ و تازەو رەنگینا کوردستانێ لوارگەهێ هەلکەفتێ بلند وەکی کەلا ئامێدیێ کو ل لایێ ژووری و رۆژئاڤا لهنداڤی ریباری و بەرانبەر سیلاڤا رەنگین جهێ ئەڤیندار و سەر شویا زاڤاو مزیرکا یا لناڤ سێ بلنداهیا چیایێ مەتینا ل لایێ ژووری تەحتا خەلیلاغای ل لایێ رۆژ ئاڤای دگەل مێرگێ و سیار ل لایێ رۆژ هەلاتێ‌ڤە لهنداڤی دەشتا درێژا پر سپەهیا پر کانی ئو جو و جوبار یا زێیێ رەنگین و ریێ شین تێرا دچن ژبلی ئاڤا سپنەی ئەو دەشتا زێ تێرا دچیت بناڤێ زێیێ‌ژی بناف کریە دبێنێ دەشتا زێی ئەو

